حامید گەوهەری

# کۆماری دیموکراتی

ئایدیۆلۆژی ، ستروکتور ، ستراتیژی ، تاکتیک و کردەوەکانی

# پارتی کرێکارانی کوردستان

# PKK

سوید

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

بۆ ئەوە خامەم هەڵنەگرتووە کە بە نووسینی «کۆماری دیموکراتی» ناوی پاک بە سەر دەستی کاربەدەستانی دەوڵەت و حکومەتی تورکیادا بکەم و تاوان و جنایەتەکانیان لەژێر تەم و مژی سیاسەتدا بێ ڕەنگ و بچووک نیشان بدەم و خەبات و گیانبەختکەریی ڕۆڵە پاڵەوان و فیداکارەکانی کورد بۆ بەدەست هێنانی مافی ڕەوای چارەنووسی نەتەوەیی لەژێر پێ نێم. مرۆڤ ئەگەر سەیری لاپەڕەکانی مێژووی کورد بکات، دەبینێ دەوڵەت و حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی تورکیا لە مستەفا کەمالەوە بگرە هەتا سلێمان دەمیرێل و بلند ئەجەوید، دەزانێ ئەوان چۆن لە ماوەی ٧٦ ساڵی ڕابردودا، نەتەوەی ئێمەیان چەوساندووەتەوە و بۆ بەچۆکدانی کورد لە هیچ جنایەتێک دەرحەق بە کورد درێغیان نەکردووە و نایکەن!

دەوڵەتی تورکیا، کوردی بە تورکی کێوی ناساند، زمان و کولتووری لێ یاساغ کرد، گوندەکانی لێ سووتاند و لە ماڵ و شوێنی ژیانی باو و باپیرانی دووری خستەوە، ئەیهێشت کورد وڵاتەکەی ببوژێنێتەوە و تەنانەت بۆ ئەوەی ڕەگەزی نەتەوایەتیی لێ بسڕێتەوە، هەوڵی توانەوەی دا، بەڵام کوردی کۆڵنەدەر هەم لە بەرامبەر تورکە عوسمانلییەکاندا خۆی ڕاگرت و هەم پیلانەکانی تورکە کەمالیستەکانی پووچەڵ کردەوە و بە خۆڕاگری چەندین بەرگی زێڕینی خستە سەر لاپەڕەکانی مێژووی پڕ لە کارەساتی نەتەوەکەمان، کە بەشێکی ئەمانەن:

١- یەکەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد بە مەبەستی پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە ساڵی ١٨٨٠ لە کوردستانی ژێردەستی عوسمانلییەکاندا سەری هەڵدا.

٢- یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی کوردستان، ساڵی ١٨٩٨ بە دەستپێشخەری میقداد مەدحەت بەدرخان، کوردی دانیشتووی ئەو بەشەی کوردستان چاپ و بڵاوکرایەوە.

٣- ئاڵای کوردستان بەو زەمینەیەی ئەمڕۆی کە کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق بە ئاڵای کوردستانی ناساند، یەکەمجار ساڵی ١٩٢٠ بە دەست «زەینەلعابدین» نوسەری «جەمعیەتی تەعالی کوردستان» دروست کرا و بۆ یەکەم جاریش لە ساڵی ١٩٢٧، لە لایەن ئیحسان نوری پاشاوە لە سەر چیای ئاگری هەڵکرا.

ئەوانە چەند نمونەیەکن لە خزمەتی گەلی ئێمە لە باکووری کوردستاندا، کە گرنگایەتییەکی تایبەتیان لە مێژووی نەتەوەکەماندا هەیە.

بزووتنەوەکانی کورد لە بەشە جیاوازەکانی کوردستاندا، ئەمڕۆ شێوازێکی گرنگ و تایبەتییان بە خۆوە گرتووە و بە هەزاران سیاسەتزان، نوسەر، شاعیر، خوێندکار، جوتیار، بازرگان و ڕۆشنبیریان لە دەوری خۆیان کۆ کردووەتەوە. لە بەرامبەر ئەو ڕەوتەدا، هەموو چین و توێژەکانی گەلی کوردمان شۆڕشەکان بە هی خۆیان دەزانن و لە بەرامبەر سەرکەوتنەکاندا شاد دەبن و لە شکانەکانیشدا خۆیان بە بەرپرس دەزانن و هەست بە ئازار دەکەن.

ئەگەر سیاسەتزان و نوسەرانی ئێمە پێشتر دەرفەتی ئەوەیان نەبووە، وەک پێویست بزووتنەوەکانی کورد هەڵسەنگێنن و لایەنی پۆزەتیف و نەگەتیڤیان ڕوون بکەنەوە، ئەمڕۆ سەدان خامە بەدەستی کورد، بۆ کەم کردنەوەی هەڵەکان، بە فکر و شێوازی جیاواز خەریکی توێژینەوە و هەڵسەنگاندنی بزووتنەوەکانن، چ بە کتێب و نامیلکە دەرکردن یان بە نوسین لە بڵاوکراوە هەمەجۆرەکاندا.

هەموو ڕێکخراوێک مافی خۆیەتی ستراتیژی و تاکتیک بۆخۆی دارێژێ و بۆ جێبەجێ کردنیشیان خەبات بکات و ئێمەش ئەرکی سەرشانمانە بەپێی توانا یارمەتییان بدەین و لە بەرامبەر دوژمندا بیانپارێزین. ئەمە تا ئەو جێیە شەرعیەتی هەیە، کە ئەو ڕێکخراوانە لە خزمەت بەرژەوەندی گەلی کورددا بن، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئەوەمان بینی، دەبێ چاو لە بەرژەوەندییە کەسییەکان بپۆشین و هەڵەکان دەست نیشان بکەین و نەهێڵین گەلەکەمان بەلارێدا بدەن.

کورد بۆ ئەوەی ناکامی پۆزەتیف لە بزووتنەوەکانی وەرگرێ و لە گێژاوی سیاسەتی جیهانیدا نوقم نەبێ، پێویستە پرۆسەی ژیانی نوێی جیهان لەبەر چاو بگرێ و تاکتیکەکانی بە شێوەیەک دارێژێ کە لەو زەریا بێبنەدا بتوانێ پاپۆڕی نەجات بە ڕوخ بگەیەنێ. تیرۆر و تەقاندنەوەی شوێنە گشتییەکان، بێ حورمەتی کردن بە مافی مرۆڤ، خۆبواردن لە دیپلۆماسی جیهانی بە پشت بەستن بە تیۆریی

دڵخۆشکەرانەی نەگونجاو لەگەڵ کێشەی کورد و سەرئەنجام پشت بەستن بە سیاسەتی دەوڵەتە کۆنەپەرستو سەرکوتکەرەکانی هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، جیا لە زیان بە بزووتنەوەکانی کورد، سوودێکی تری نییە.

کورد بۆ ئەوەی سەرکەوێ، بە ڕای من دەبێ بە چنگ و ددان بەرگری لەو ئەزموونە بکات کە گەلی ئێمە لەژێر چاودێری نەتەوەیەکگرتووەکاندا، لە هەرێمی کوردستانی عێراق خەریکی تاقیکردنەوەیەتی و بۆ ئەمەش پێویستە بە هەموو شێوەیەک هەوڵ بدات لەنێوان هێزەکانی ئەو هەرێمەدا ئاشتی پێک بێ، نەک دروشمی ئاشتی هەڵگرێ و بۆخۆی لایەنێکی شێلگیر بێ لە درێژەدانی شەڕەکەدا.

حامید گەوهەری - ١٩٩٩/٨/٢٥

## سەرەتا

لەو وڵاتانەدا کە سیستەمی پلورالیزمی سیاسیان تێدا جێگیر نەبووە و دانیشتوانی وڵاتەکەیان لە چارەنووسی خۆیاندا بەشدار نەکردووە، گەلێک گرووپی (مەحفەل) خاوەن ئایدیۆلۆژیای جۆراوجۆریان تێدا سەرهەڵدەدات. ژمارەیەک لەوان لایەنگر یاخود سەربە ڕێکخراوە سیاسییەکانن و بە نهێنی لە لایەن ئەوانەوە ڕێنوێنی دەکرێن و ژمارەیەکیشیان گرووپی نوێن و بەڕواڵەت بەدوور لە چاوی پۆلیس و لێپرسراوانی پاراستنی زانکۆکان خەبات دەکەن و جارجارەش بۆ مەبەستێکی تایبەت بە ئایدیۆلۆژی خۆیان کۆ دەبنەوە، سمینار پێکدێنن و خۆپیشاندان ڕێک دەخەن. ئەو گرووپە نوێیانە بەهۆی کەم ئەزموونی لە خەباتی سیاسیدا، خێراتر ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێ و زەبریان لێ دەکەوێ. ئەو ڕەوتە شتێکی تازە نیە و لە کۆنەوە لە زانکۆکانی تورکیادا باوە و هەموو ساڵێ بە دەیان خوێندکار بە تاوانی خەباتی سیاسی دەکەونە ژێر لێپرسینەوەی پۆلیس، دەگیرێن و شکەنجە دەدرێن.
تورکیا یەک لەو وڵاتانەیە کە هەمیشە لەگەڵ کێشەی خوێندکارانیدا دەستەویەخەیە. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆنیەتی هەڵکەوتوویی خاکەکەی، کە بەشێکی لە بازنەی جوگرافیای ئەورووپادا جێی گرتووە و زووتر لە دراوسێیەکانی، فەرهەنگ و پێشکەوتنەکانی ئەورووپا کاری لەسەر دانیشتوانی کردووە.
دواکەوتوویی فەرهەنگی تورک لە لایەک و دامەزرانی ژێرخانی دەوڵەتەکەیان لەسەر سیستەمی کەمالیزم و گوێ نەدانیان بە مافی دیموکراتیی دانیشتوان لە لایەکی ترەوە، بە شێوەیەکی بەردەوام خوێندکارانی تورکیای تووشی بەربەرەکانییەکی زیاد لە چاوەڕوانی کردووە. لە تورکیا و تەنانەت لە ئێرانی ئیسلامیشدا دەزگای پاراستنی حکومەتە کارتۆنییەکان بۆ ناسینی گرووپ و مەحفەلەکانی خوێندکاران لە شێوازی جۆراوجۆر کەڵک وەردەگرن. لەوانە دروست کردنی گرووپی دەستکردی بە

ڕواڵەت سیاسی و ناردنی سیخوڕ بۆ ناو گرووپەکانی تر بە مەبەستی ناسینی ئەندامانی گرووپەکان و ناساندنیان بە دەزگاکانی پاراستن.
ئەمە دیاردەیەکی تازە نیە، کە لە خەڵک و بەتایبەتی لە خوێندکاران و کەسانی بە ئەزموونی سیاسی شاراوە بێ، بەڵکو دیاردەیەکی کۆنە و دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی و دابەشبوونی جیهان بەسەر دوو سیستەمی بۆرژوازی و بە ڕواڵەت سۆسیالیستیدا و دەستپێکردنی شەڕی سارد لەنێوان ئەو دوو سیستەمەدا سەری هەڵداوە و لە شەستەکانەوە بە بەرزترین لوتکەی خۆی گەیشتوە.

ئەندامانی ئەو گرووپانە بەگشتی لە خوێندکاری زانکۆکان پێک دێن. هەروەکو گوتم بەشێکیان سەربەخۆن یان لە ڕێکخراوە سیاسییەکان لایەنگری دەکەن و ژمارەیەکی کەمیشیان فەرمانی دەزگاکانی پاراستنی زانکۆکان بەڕێوە دەبەن. ئەو بەشەی دوایی، بەگشتی لە بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی سەر بە حکومەتن، هەرچەندە کەسانی هەژار و دەست کورتیش هەن، کە لە ڕووی نەزانی و بەمەبەستی خزمەت کردن یان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دوای ئەو گرووپانە دەکەون و هاوکاریی ئەوان دەکەن.

ئەو گرووپە ئایدیۆلۆژی یانە بەگشتی لە چەند کەس تێناپەڕن. ئەوانە بۆ چەسپاندنی ئایدیۆلۆژیای خۆیان هەمیشە بە یەکەوە مشتومڕیانە و هەندێک جاریش دژکردەوەکانیان حاڵەتی فیزیکی بەخۆوە دەگرێ و هەر گرووپەی دەیەوێ بە زۆر ئایدیۆلۆژی خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێ. دەبێ لەبیر نەکەین کە مۆتۆڕی بزواندنی ئەو کێشە فیزیکییانە، ئەگەر بەشێکی لە هەستی لاوێتییەوە سەرچاوە بگرێ، بەشە مەزنەکەی تری لە لایەن گرووپەکانی سەربە دەوڵەتەوە وەگەڕ دەخرێن. ئەوان بەو کارەیان، لە لایەک ئەندامی گرووپەکان ئاشکرا دەکەن و لە لایەکی ترەوە بە قازانجی دەوڵەت نایەڵن گرووپەکان لێک نزیک ببنەوە و یەک بگرن. لەوانە گرنگتر ئەوەیە، کە گرووپەکان بەرەو چەوتی پاڵ پێوەدەنێن و هەوڵ دەدەن دوژمنایەتی یەکتر بکەن. بەگشتی گوشاریان بۆ دێنن، کە لە هێڵی شۆڕشگێڕیی دووریان بخەنەوە. تاقیکردنەوەکان پیشانیان داوە، کە حکومەتەکانی تورک و ئێرانی لەو ڕێگایەدا سەرکەوتوون و گەلێک دەستکەوتی بەنرخیان بەدەست هێناوە و ئاژاوەیەکی زۆریشیان خستووەتە ناو ڕیزی بزووتنەوەکانەوە.
سەرکەوتنی ئەو حکومەتانە لەوەدایە، کە بەشێوەی ناڕاستەوخۆ، بە بڵاوکردنەوەی

تیۆریی نادروست، ئەندامی گرووپە خوێندکارەکان توند و تیژ بارێنن و لە بوارەکانی ئایدیۆلۆژی و پراکتیکدا، مارکسیستەکان تووشی لادان و چەپڕەوی دەکەن، بەشێوەیەک کە ئەتوانن بەپێی هەلومەرجی خەبات لە هێز و توانای خۆیان بە قازانجی کۆمەڵ کەلک وەرگرن. دروشمی مەزن و بەرەواڵەت شۆڕشگێرانەیان پێ هەڵگرن و لەژێر چەرخی ڕاستیی بزووتنەوەکاندا دەهانچەمێننەوە، چونکە لە پراکتیکدا ئایدیۆلۆژییەکەیان بڕ ناکات و سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، پارچە پارچە دەبن و لە دنیای سەرگەردانیدا دەخولێنەوە.

ئەندامانی سەر بەو گرووپانە بەگشتی پتر لە بیری ستالین و ماوتسی تۆنگ پەیڕەوی دەکەن و ئەگەر مرۆڤ فکر و بۆچوونەکانیان لەبەرچاو نەگرێ، دەبینێ زۆربەیان کەسانی سادە، دڵسۆز و خۆبەختکەری کۆمەڵن. ئەوانە بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بێنن، لە ڕادەبەدەر خۆیان ماندوو دەکەن و دەبنە هۆی ماندووکردنی هەڤاڵانیشیان و زیانێکی زۆریش بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نەتەوە ژێردەستەکان دەگەیەنن. بەهۆی دروشمە بریقەدارەکانیان، کەسانی کەم ئەزموونیان لێ کۆدەبێتەوە، بەپەلە هەڵدەدەن و بەپەلەش تووشی قەیران دەبن و هەلومەرجی خەبات دەبانهاڕێ و لە نێوان جیاوازییەکانی تیۆری و پراکتیکدا بێ هێز و تواناییان دەکات. ئەوانەی دەگیرێن و دەکەونە دەست پۆلیسی حکومەتەکان، چونکە نەسرەوتن و شەکەت و بارقورسی خەباتن، زوو وزەیان نامێنێت و هەڵوێستەی بۆ ئەکەن. زۆربەیان لە زیندانەکاندا دەشکێن و ئەوانەش کە لە گۆڕەپانی خەباتدان، لە پراکتیکدا تووشی گرفت دەبن و هەر ڕۆژەی کوتێکیان لێ دەبێتەوە و سەرئەنجام زەحمەتەکانیان بەفیڕۆ دەچێ. نموونەی ئەو ڕێکخراوانە لە ئێران و تورکیادا بە ڕادەیەکن، کە هەر لێکۆڵەرێک دەتوانێ چەند نموونەی مێژووییان بۆ ڕیز بکات.

پارتی کرێکارانی کوردستان (پ.ک.ک) یەکێک لەو ڕێکخراوانەیە، کە بە کاریگەری ئەو ڕەوتە پێی ناوەتە قۆناغی خەباتی سیاسی و چەکدارییەوە. وەک دەزانین زۆر زوو گەشەی کرد و زووش تووشی قەیران و کەندوکۆسپ بوو. هەرچەندە زۆرن ئەو مامۆستایانەی کە هەست بەو ڕەوتە سروشتییە دەکەن، بەڵام بۆ ڕوون بوونەوەی پتری ئەوەکانی داهاتووی کورد، پێویستە ئاوڕێکی کورت لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژی، ستروکتور و کردەوەکانی پ.ک.ک بدەینەوە، تا بزانین ئەو جۆرە ڕێکخراوانە چۆن لە جەوێکدا، کە هەست و بیری لاوییەتی تیایدا حاکمە، لە

چوارچێوەیەکی بەستراوی دوور لە ئازادییە دیموکراتییەکانەوە سەرهەڵدەدەن و لە دوایی دا دەشکێن و چرای ژیانیان دەکوژێتەوە.
لێرە مەبەست لە دەرخستنی چاکە و خراپە یان قازانج و زیانەکانی پ.ک.ک نیە و بۆ ئەوەش خامەم هەڵنەگرتووە کە کەسێک بریندار بکەم یان بەشێک لە خزمەتەکانی پ.ک.ک بە زمان و کولتوری نەتەوەکەمان لە باکووری کوردستان دا بخەمە ژێر نیشانەی پرسیارەوە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە، زەحمەت و گیان بەختکەریی ئەوەکانی داهاتوومان لە بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازانەی گەلەکەمان بەفیڕۆ نەچێ و نەوەک، گوێی شەهیتان کەڕ بێ، ئەوانەی بەمەبەستی خزمەت بە کورد بێ دەمێنە گۆڕەپانی خەباتەوە، فریوی دروشمی نەگونجاو لەگەڵ هەلومەرجی کوردستان بخۆن و بەجێی خزمەت، زەبر لە بەرژەوەندییەکانی نەتەوە و نیشتمانەکەیان بدەن.
من بۆ دەرخستنی ڕاستییەکان، نوسینەکەم بە بەڵگەنامەکانی پ.ک.ک و وانە دەرسییەکانی فێرگەی بارهێنانی ئەو ڕێکخراوەوە دەبەستمەوە، کە هەڤاڵ جومعە «جەمیل بایک» لە کتێبێکدا بە ناوی (مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان) بە زاراوەی سۆرانی بڵاوی کردووەتەوە.
لە کۆتاییدا بە ئەرکی دەزانم کە سوپاس و ڕێزی خۆم ئاراستەی ئەو دۆستە ئازیزانەم بکەم، کە لە وەرگێرانی بەڵگەنامە تورکی و عەرەبییەکان و پێداچوونەوەی کتێبەکەمدا یارمەتییان داوم. ئەوانە بریتین لە : لونفی باکسی، محەمەد ئەمین سەراجی ، ویلدان ئانریکلو، م . ر ، عەباسی ڕەمباتی ، ئەوزاد وەلی و کەمال گەروێسی، کاک ئەوزاد پێشەکییەکیشی بۆ کتێبەکە نوسیوە، کە دوای ئەو بەشە چاوتان پێی دەکەوێ. هەروەها سوپاس و ڕێزی خۆم ئاراستەی ئەو دۆستە ئازیزەم دەکەم، کە خەرجی چاپی کتێبەکەمی بەئەستۆ گرت.

# ئایدیۆلۆژی پارتی کرێکارانی کوردستان

هەڤال جومعە لە لاپەڕەکانی ٣٦-٢٧ی مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستاندا دەڵێ:

**- تا بەر لە سالانی 70 هێشتا سەرمایەداری نەکەوتبووە نێو کوردستان و خەباتی نوێی چینایەتی پەیدا نەببوو..... سەرمایەداری لە کاتێکدا کەوتە کوردستان کە سەرمایەداری تورک پێویستی بە کەرەستەی خاو هەبوو. کاتێک سەرمایەداری خستە کوردستان لە دەرەوەی ئیرادەی ئەوان چینێکی تر دروست بوو، کە چینی پرۆلیتارییە. هەڵبەت کاتێک ئەو چینە دروست دەبێ بیرو ئایدیۆلۆژییەکەشی لەگەڵیا دەردەکەوێت، کە پاشان لەسەر ئەم بناغەیە هەڵدەستێ بە خەبات و تێکۆشان لە پێناوی ناسینی خۆی و دەستبەر کردنی قازانج و بەرژەوەندییەکانی.**

عەبدوڵلا ئۆجەلان دوای سالی ١٩٧٠ و ڕەگازۆیی کردنی سەرمایەداری بۆ کوردستانی ژێردەستی تورکیا، بە بەرزکردنەوەی ئەو تیۆرییە پێ دەنێتە گۆڕەپانی خەباتی ئایدیۆلۆژییەوە. ئەو سەرەتا لەسەر سۆسیالیزم دەکۆڵێتەوە و بە خوێندنەوەی دوو کتێبی **«مەسەلەی چارەی خۆنووسین»** و **«خەباتی نەتەوایەتی»** لە لینین و **«مەنیفێستی کومۆنیزم»** لە مارکس و ئەنگلس(١) بۆی دەرکەوتووە کە بیری سۆسیالیزم تەنیا وەلامە بۆ کوردستان و لەمەبەولا هیچ بیروباوەڕێکی تر ناتوانێ وەلامی پرسی کوردستان بداتەوە، هەر بۆیە بیری سۆسیالیزمی زانستی وەکو تەنیا ڕێگەچارە بۆ پرسی کوردستان هەڵبژاردووە(٢). ناوبراو سۆسیالیزمی بنیادنراوی سۆڤیەت، چین و ئەلبانیا ڕەد دەکاتەوە و راستی و نادروست بوونی ئەوانی بۆ دەرناکەوێ، بەلام دەڵێ:

---

١- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ٤٩-٥٠

٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٤٠

- .... ئەو سۆسیالیزمەی لە ئاراوا بوو دەنی بە پرسی کوردستان نەدەدا، یاخود کێشەی کوردستان لە لای ئەوان گرنگیەکی نەبوو. سۆسیالیزمی بنیاتنراو بەهۆی خەریک بوونی بە شەڕ و ململانێ لەگەڵ ئیمپریالیزم، پرسی گەلانی بندەست و چینی بندەستی لەبیر کردبوو و دەیانگوت: ئێمە بۆ سۆسیالیزمی یەکێتی سۆڤیەت شەڕ دەکەین، بەلام ئێوە شەڕ مەکەن (مەبەست گەلانی بندەست) تاکو خۆتان بۆ سۆسیالیزم دەسەلمێنن(٣).

ئوجەلان رای وابووە، کە کتێبە کۆنەکانی سۆسیالیستی وەکوو مارکس و ئەنگلس و لینین و ماو ....، لە لایەکەوە کەم بوون و دەست نەکەوتن و لە لایەکی تریشەوە میتی (MIT) تورکیا بەو ناوانە پەرتووکی لە لای خۆیەوە بە ناوەڕۆککراوی بلاوکردووەتەوە. ئامانجیشیان شێواندنی راستی و تێکدانی بیری شۆڕشگێڕی بوو، واتە خەلک بە هەلە و چەوتی لە سۆسیالیزم تێبگەن. لە بەرامبەر ئەوەشدا پەرتووکی راست زۆر کەم بوون، هەروەها هێلی ئۆپۆرتۆنیزم (Oportonism) و ریڤیزیۆنیزم (Revisionism) زال بوون کە کار و ئەرکی شۆڕشگێڕی گرانتر و زەحمەت تر دەکرد(٤).

ئوجەلان دوای ئەو توێژینەوەیە، ئەزموونەکانی شۆڕشی ڤێتنامی کردووەتە رێنوێنی ئایدیۆلۆژییەکەی و لەو روانگەیەوە کە ڤێتنام دوو پارچە کرابوو و لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا شەڕی رەوای بەڕێوە دەبرد، دۆزی کوردستان و ڤێتنام لە تەرازوو دەنێ و بە پێویستی دەزانێ کە کوردیش بەچەشنی ڤێتنامییەکان شەڕی ئەمریکا بکات(٥). رەنگە هەر ئەو بۆچوونەش وای لە ئۆجەلان کردبێ، کە بە لاسایی کردنەوە لە هۆشیمینە، نازناوی ئاپۆ (مامە) لەسەر خۆی دانێ و ئاپۆ و ئاپۆییزم بکاتە تیۆری و ستراتیژی پ.ک.ک ی لەسەر دامەزرێنێ و بۆ بەدیهێنانی سۆسیالیزم هەوڵ بدات.

٣- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٤١
٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٤٨
٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٣٩-٤٠

# پێکهاتنی گروپی ئایدیۆلۆژی پ.ک.ک

عەبدوللا ئۆجەلان داهێنەری ئایدیۆلۆژی پ.ک.ک یە. ناوبراو سالی ۱۹۷۲ ل زانکۆی ئەنکارا، لەگەل دوو کەس بە ناوەکانی حەقی قەرار (لاز) و کەمال پیر (تورک) ئاشنا دەبێ و بە هاوکاریی ئەو دووکەسە گروپێکی ئایدیۆلۆژی مارکسی-لینینی یان پێکهێناوە. دوای ماوەیەک کەمال پیر، نوسەری کتێبی مێژووی پ.ک.ک. واتە «جەمیل بایک»ی بە گروپەکەیان ناساندووە.

لە کودیتای ۱۲ی ئاداری ۱۹۷۱دا، چەپی تورک گورزێکی کوشندەی لێ دەکەوێ و دوژمن بلاوە بە رێکخستنەکانیان دەکات و سەرۆکەکانیشیان دەکوژێ. ئەوانەش کە دەمێنن، دەکەونە دەست پۆلیس. کۆلیجی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنکارا بە یادی شەهیدانی ئەو رووداوەوە، رێپێوانێکی ماتەمینی و نارەزایی بەرامبەر ئەو رەشەکوژییە ساز دەکات. لەو رێ و رەسمەدا، ئۆجەلان و خوێندکارێکی تر لە لایەن پۆلیسەوە دەگیرێن و دوای حەوت مانگ لە زیندان ئازاد دەکرێن. ئۆجەلان لەسەر زیندانی بوونەکەی خۆی ئەڵێت:

**لەو گیرانەمدا تێگەیشتم زیندان چیە و چ نیە، هەرچەندە ئەشکەنجەیەکی وەهاشیان نەکردین، بەلام تەنیا ئەو ئەشکەنجەیەی بینیم، بۆم بوو بە دەرسێک کە جارێکی تر بە هیچ شێوەیەک خۆم نەدەمە دەست. ئەوە وایکرد هەرگیز خۆم نەدەمە دەست و نەگیرێم (۱).**

سالی ۱۹۷۳، سەرلەنوێ جموجوڵی خوێندکاران دەست پێدەکاتەوە. دەولەتی تورکیا بۆ کۆنترۆلی خوێندکارە نارازییەکان، بەهۆی خوێندکارە لایەنگرەکانییەوە، کۆمەلەیەکی دامەزراند، کە ناوی کۆمەلەی خوێندنی بالای دیموکراسی (ADYOD) ئەنکارا بوو. هەرلەو سەردەمەشدا (۱۹۷٤)، چەپەکانی کوردیش رێکخراوێکی نهێنی بەناوی بیرۆی کولتوری شۆرشگێری رۆژهەلات (DDKD)

۱- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەرەی ۷۹

پێکدینن. ئۆجەلان و هەڤالانی دەچن لەو کۆمەڵەیەدا دەبن بە ئەندام، کە بە وتەی جومعە سەر بە دەوڵەت بووە(٢) و هاوکاریی ڕێکخراوە کوردییەکەیان نەکردووە. جومعە دەربارەی چوونیان بۆ نێو کۆمەڵەی خوێندنی باڵای دیموکراسی لە ئانکارا و هاوکاریی نەکردنیان لەگەڵ بیرۆی کولتوری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵات دەڵێ:

**- ئەگەر چووبایینە ناو ئەم ڕێکخراوە، بزووتنەوەی چەپ لاواز دەبوو. هۆی دووهەم بۆ ئەوە بوو کە پۆلیس گومانمان لێ نەکات و نەمانخاتە ژێر چاودێری خۆی، چونکە ئێمە هێشتا گروپێکی نوێ بووین و ئەگەر چووبایینە نێو بزووتنەوەیەکی کوردی، ئاشکرا دەبووین و سەرنجی پۆلیسمان ڕادەکێشا سەرخۆمان(٣).**

گروپی ئایدیۆلۆژیی ئۆجەلان ئەوکاتە فکری دامەزراندنی ڕێکخراوێکی جیاواز و تایبەتیان بۆ کوردستان لە بەرنامەدا نەبوو. ئەوان ویستویانە لەگەڵ گروپە چەپە هاوبیرەکانیان گفتوگۆیەکی هاوبەشیان هەبێ و بەیەکەوە بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم لە تورکیادا هەوڵ بدەن.

ئۆجەلان ساڵی ١٩٧٥ سەفەرێکی کوردستان دەکات و لەو سەفەرەیدا چاوی بە «سراج بیلگین»ی نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان- تورکیا و «کەمال بورقای» سەرۆکی ئێستای پارتی سۆسیالیستی کوردستان و سەرۆکی ئەوکاتەی پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی تورکیا (TIP) دەکەوێ. ئۆجەلان، پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا بە دژی سۆسیالیزم و پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی تورکیا بە پارتییەکی فاشیست دەناسێنێ(٤). جیا لەوانە لەسەر ڕێکخراوە مارکسیستەکانی تورکیاش دەڵێ:«ئەوانە لەسەر ڕێبازی لینین نەبوون(٥).» لەم ڕوانگەیەوە، گروپی ئایدیۆلۆژیی ئۆجەلان یەکێتیی و یەکگرتن لەگەڵ گروپە چەپ و کوردییەکان بە مردنی بزووتنەوەی سۆسیالیستی و پرۆلیتاریا دەبینێ و لەگەڵ هیچکامیان ڕێک ناکەوێ.

ئۆجەلان و هەڤالانی بەهۆی چالاکی و خزمەتەکانیانەوە لە کۆمەڵەی خوێندنی باڵای دیموکراسی ئەنکارادا، ئەو کۆمەڵەیە دەخەنە دەستی خۆیان و وەک نوسەر دەڵێ، ئۆجەلان لەژێر پەردەی خەبات لەو کۆمەڵەیەدا هەم خۆی و هەم بزووتنەوەکەی بەهێز کرد. لەو کاتەدا دەزگای پاراستنی تورکیا(میت) هەست بە جموجوڵی گروپی

---

٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٨٠
٣- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٨١
٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٨٥
٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٨٤

ئۆجەلان دەکات و چەند بەکرێگیراوێک دەنێرێتە ناو ڕیزی گروپەکەی ئۆجەلانەوە. ئەمە بە تایبەتی لەو دەمەوە دەستی پێکردووە، کە کۆمەڵەی (ADYOD) دامەزراوە و ئۆجەلان ئەوی خستووەتە دەستی خۆی(٦). نوسەر دوو کەس بە ناوی عەبدولرەحمان خەڵکی ئاگری و ئەجاتی کەیا (پیلوت)، کە خوێندکاری کۆلێجی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئانکارا بوون، بە خوێنەری کتێبەکەی دەناسێنێ و دەڵێ ئەوانە هەردوو سیخور بوون و میت تێکەڵی گروپەکەیانی کردوون. ئەو هەروەها ناوی دوو کچیش ڕادەگەیەنێ کە بەڕێگای کۆمەڵەی (ADYOD)ەوە تێکەڵی گروپەکەیان بوون. یەکێکیان کچێکی خەڵکی یۆزگوسلافیا بووە بە نازناوی «نادیرە» و ئەوی تریان ناوی «کەسیرە» (فاتمە) و خەڵکی دێرسیم بووە، کە دوایی شوی کرد بە ئۆجەلان، بەلام پێکەوە نەسازان و لێک جیا بوونەوە. نوسەر لەم بارەیەوە دەڵێ:

- لە مێژووی ئێمەدا عەبدولرەحمان و فاتمە، هەریەکەیان تەنیا کەسێکیان هێناوە و بە گروپیان ناساندووە کە هەردووکیشیان سیخوڕ دەرکەوتن. ئێمە عەبدولرەحمان کاتێ تەڤلی ئێمە (مەبەست پەیوەندی گرتنە- نوسەر) بوو نەدەناسی، لەبەر ئەمە پیلۆتیش کە لەگەڵ خۆی هێنا، ئەویشمان نەدەناسی. هەرچی فاتمەیان کاتی پەیوەندی بە ئێمەوە کرد دەمانزانی کە لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگ بوو لە دێرسیم، کە دەستیان بە خوێنی کورد سوور ببوو. ئەو بنەماڵەیە لە کاتی سەرکوت کردنی سەرهەڵدانی دێرسیم و لە سێدارەدانی سەید ڕەزا و هەڤاڵەکانی و گەلێک وڵاتپارێزی تر، هاوکاری دەوڵەتیان کردبوو. ئێمە ئەو شتانەمان دەزانی، تا ئەو جێیەی کە بوو بەهۆی دەرکەوتنی گفتوگۆیەکیش لە نێوانمانا. ئێمە کە نەماندەویست فاتمە لەنێو خۆماندا قەبوول بکەین، لەبەر ئەم هۆیە بوو. چونکە دەمانگوت: «ئەو کچە لە بنەماڵەیەکی خیانە و دەستیان گەوتۆتە خوێنی کوردان. ئەم ڕاستییەش هەرکەس دەیزانێ، بۆیە ناتوانین کەسێک لەو بنەماڵەیە قەبوول بکەین.... ئەمە تێروانین و ڕای زۆربەی هەڤاڵانیش بوو. هەڵبەت تێروانین و بۆچوونی سەرۆکایەتی ( مەبەست لە ئۆجەلانە- نوسەر) وەکوو هی ئێمە نەبوو. بەڵکو سەرۆکایەتی زۆر زانستیانە و قوڵتر بیری لێ دەکردەوە و دەیگوت: «ڕاستە بنەماڵەی ئەم کچە بنەماڵەیەکی پیس و گڵاوە و دوژمن دەستی خۆی خستۆتە ناوی و دژی کورد بەکاری هێناون، بەلام نابێ ئێمە لێیان دوور کەوینەوە، بەڵکوو پێویستە ئێمەش دەستی خۆمانی بخەینە ناو منداڵەکانیان ڕایانکێشین و هەم لە دژی بنەماڵەی خۆی و هەم لە دژی دەوڵەتیش بەکاریان بێنین.، هەروەها دەیگوت: «ئێمە تەنیا بەم ڕەنگە

---

٦- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٩٢

PKK ailesine giriş dönemi. Yıllarca uğraş veriyoruz.

Dönüp duruyoruz, ama çok az bir gelişme kaydediyoruz. Önemli olan burada yine devlettir. Devletin Ankara'dan çıkışımıza tavrıdır.

Ben devlete 1966'dan itibaren maddi olarak dayanmışım ve ancak 1977-1980'lerde kopuşa geçeceğiz. Tam 12 yıl, devletin maddi olanaklarıyla, yarattığı ortamla belli bir mesafe almışım. Ve çıkış yapmaya çalışırken çevremize dolanlar var. Yenilmiş veya kemalist sol etkilemeye çalışıyor. Ankara'da Kürtçülük yapmak isteyen KDP temsilcileri var. Onlar da dolaylı olarak kontrol altına almak istiyor-

93

من له سالی ١٩٦٦ەوه پشتم به دەولەتەوه بەست و له سالانی ١٩٧٧- ١٩٧٨ پرۆسەی دووركەوتنەوەم له دەولەت دەستی پێكرد. به تەواوی دوازده سال به ئیمكاناتی ماددی و دەرەتانێك كه دەولەت بۆی جێبەجێ كردم چوومه پێشەوه

عەبدوللا ئۆجەلان

دەتوانین تۆڵەی خۆمان و میللەتیشمان لێ بکەینەوە. مادام ئەو بنەماڵەیە هێندە خراپەی کردووە، ئەگەر ئێمە بتوانین منداڵەکانیان لێ دوور کەینەوە و رایانکێشینە ئەو بزووتنەوە، دەتوانین گورزێکی کوشندە لەو بنەماڵەیە بوەشێنین. پێویستە ئێمە مێژوو بە پێچەوانە هەڵگێڕینەوە(٧)،. نوسەر لە درێژەی ئەم باسەدا دەڵێ:

- لە هەمووشی گرنگتر ئەوە بوو کە سەرۆکایەتی هیچ کاتێ فاتمەی وەکوو کەسێک نەدەدیت و لێی نەدەڕوانی و دەیگوت: 'ئەمە تاکە کەسێک نییە، بەڵکوو چینێکە و نوێنەرایەتی چینێک دەکا لە کوردستان کە بەکرێگیراو و خەیانەتکارە. ئەم چینە هەردەم ئامادەیە لەگەڵ دژمن رێک بکەوێت و خزمەتی بکات. ئەگەر تۆ بتەوێ کێشەی سەربەخۆیی و ئازادی لە کوردستان چارەسەر بکەی، پێویستە بەر لە هەموو شتێک مەسەلەی ئەو چینە چارەسەر کەی. ئەگەر رەوشی ئەو چینە چارەسەر نەکەی و لە دژایەتی کردنیدا سەرنەکەوی، هەرگیز ناتوانی کێشەی کوردستان چارەسەر بکەی.... دەبێ مرۆڤ لە شەخسی فاتمەدا چینێک ببینێ لە دژی ئەو چینە شەڕی خۆی لەگەڵ فاتمە بکات و سەرکەوێ، تاکوو بتوانێ بزووتنەوەکە بە سەرکەوتن بگەیەنێ، ئەگینا بزووتنەوەی سۆسیالیستی ناتوانێ لە کوردستان پێش بکەوێ،، بەوجۆرە سەرۆکایەتی بۆچوونی زانستیانەی هەبوو، بەڵام ئێمە لەسەر زانست نەبووین(٨). نوسەر لە کۆتایی باسەکەیدا بەو ئاکامە دەگات و دەڵێ:

- ئەگەر یەکێک لێرەدا ورد بێتەوە و باش سەرنج بدات، بۆی دەردەکەوێ کە سەرۆک بەو ئامرازە هەم دەوڵەتی خاپاند و هەم دەوڵەتی خستە خزمەت بزووتنەوەکەمان و بە توانا و ئیمکاناتی دەوڵەت بزووتنەوەی رێکخست و بەرەوپێشی برد. کە واتە ئەم سەرۆکایەتییە، سەرۆکایەتێکی بەو رەنگەیە و یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەوەیە کە دژمن فریو دەدات. واتە هەم زەبری خۆی لە دژمن دەوەشێنێت و هەم دژمن دەخاتە خزمەتی گەل و بزووتنەوەکەی، ئەوە خاڵێکی گرنگە و تایبەتمەندێکی پ.ک.ک یە و بەڵکوو یەکێکە لە تایبەتمەندییە هەرە گرنگەکان(٩).

ئەو بەشەی هەڤاڵ جومعە کە دەڵێ: ئۆجەلان بە توانا و ئیمکاناتی دەوڵەت بزووتنەوەی رێکخست بە تەواوی راستە، بەڵام بەشەکەی تری چیرۆکێکی ساختەیە و رەنگە هەڤاڵ جومعە لە رووی دڵپاکی و دڵسۆزییەوە پەنای بۆ هەڵبەستنی بردبێ، ئەگینا لە راستی بەدوورە و بە مەبەستی فریودانی خوێنەران کاغەزی پێ ڕەش

---

٧- هەمان سەرچاوە لاپەڕەکانی ٩٢- ٩٣
٨- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٩٥
٩- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٩٧



پێکهاتنی ....

کراوەتەوە. جومعە نالی ئۆجەلانیش وەک عەبدولرەحمان و ئەجاتی کەیا (پیلۆت) مەئموری دەولەتی تورکیا بووە و بە فەرمانی میت ئەرکی دامەزراندنی پارتی بێ سپێراوە و مەبەستیش لەوە لەناو بردنی هێزە بەرهەڵستکارەکانی تورکیا و نزیک کردنەوەی گەل بە شێوەی نائاسایی لە رژێم بووە.

هەموو لایەکمان دەزانین شۆرشی ئەیلوول لە سالی ١٩٧٠دا رژێمی عێراقی ناچار کرد بە مۆر کردنی رێککەوتنامەی ١١ی ئادار، چونکە دەولەتی تورکیا ترسی لەوە هەبوو پریشکی شۆرشی ئەیلوول تەشەنە بکاتە باکووری کوردستان و گیروگرفتی بۆ بخولقێنێ، بۆ بەرگری کردنی ئەو، ئۆجەلان و چەند سیخورێکی تری دایە پێشەوە، تا لەژێر ئالای شۆرشگێریدا، خۆیان رێکبخەن و بە فەرمانی میت دژی بزووتنەوەی کورد بەکاریان بێنن. بۆ ئەوەی لە رادەی راستی ئەو دیاردەیە بگەین باشترە بزانین ئۆجەلان بۆخۆی چۆن لە هاوکاری کردنی لەگەل دەولەتی تورکیا دەدوێ :

**- من لە سالی ١٩٦٦ەوە پالم بە دەولەتەوە دا و لە سالانی ١٩٧٧- ١٩٧٨یشەوە پرۆسەی دوورکەوتنەوەم لە دەولەت دەستی پێکرد. بە تەواوی دوازدە سال بە ئیمکاناتی مالی و دەرەتانێک کە دەولەت بۆی جێبەجێ کردم چوومە پێشەوە(١٠).**

گرووپی ئایدیۆلۆژیی پ.ک.ک بەمجۆرە بەدەست دەزگای پاراستنی تورکیا (MIT) پێکهات و بە ئیمکاناتی دەولەتی تورکیا خۆی رێکخست و گەشەی کرد. میتی تورکیا بەهۆی ئۆجەلان و سیخورەکانیەوە هەلسورانی گرووپەکە کۆنترۆل کرد و هەتا کۆتایی ١٩٧٨ بە شێوەی راستەوخۆ بۆ مەبەستی دیاریکراو بەکاری هێنا.

---

١٠- هەندێک لە نوسراوە کۆکراوەکانی عەبدوللا ئۆجەلان لە نێوان سالانی ١٩٨٤-١٩٩٥، بەناوی ( زمان و بزافی شۆرش)، بلاوکراوەی سەرخۆبوون، ژمارەی ٨٢، لاپەرەی ٩٢، سالی ١٩٩٦/٨/١، بە زمانی تورکی. Devrimin dili ve Eylemi

## ستراتیژی گروپی ئایدیۆلۆژی پ.ک.ک

گروپی ئایدیۆلۆژی پ.ک.ک، ستراتیژیی خۆی بە مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتی سۆسیالیستی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئازادکردنی کورد و سەربەخۆیی کوردستان، لەسەر ئەو ئایدیۆلۆژییە بینا کرد. ڕێبەرانی پ.ک.ک لەم ڕوانگەیەوە دەڵێن قۆناغی خەباتی حیزبایەتییان وەپشت سەر ناوە و بوونەتە بزووتنەوەیەکی جیهانی. ئۆجەلانیش لە هاتنیدا بۆ ئیتالیا بە ڕاشکاوی لە تەلەفزیۆنی MEDtvدا ڕایگەیاند کە بە نوێنەرایەتی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هاتووەتە ئەوروپا و دەیەوێ کێشەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چارەسەر بکات و فیدراسیۆنێک لەوان پێک بێنێ!

ئۆجەلان لەبەر تیشکی ئەو ستراتیژییەدا، لە بەشی پێنجەمی کتێبی «پرسی کەسایەتی لە کوردستاندا»، کە ساڵی ۱۹۸۳ بە زمانی تورکی نوسیویەتی و «مهاباد کوردی» ساڵی ۱۹۹۲ وەریگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی، لە چەند وتارێکی وەک: پارتی دەستەی پێشڕەوی چینی کرێکارە، پارتی دەستەی ڕێکخەری چینی کرێکارە، پارتی بالاترین شێوەی ڕێکخستنی چینایەتی پرۆلیتاریایە، پارتی ئامرازی دەسەڵاتی پرۆلیتاریایە و پارتی پێکهاتووی یەکێتیی ویست و بیروباوەڕە و دەستە دەستە پەسەند ناکات، پارتی کرێکارانی کوردستان دەناسێنێ و بە ڕاشکاوی دەڵێ پ.ک.ک باوەڕی بە خەباتی فرە ڕێکخراوەیی نیە لە کوردستاندا و دەیەوێ بە ڕێگای تیۆری دیکتاتۆریی پرۆلیتاریادا، تەنیا ڕێکخراوی کوردستان بێ و تەنانەت ئەگەر ڕێکخراوێکیش هەبێ، پێویستە ڕێبەرایەتی پ.ک.ک قەبووڵ بکات و لەژێر باڵی ئەودا بجووڵێتەوە.

پ.ک.ک هەروەها بە پشت بەستن بەو ستراتیژییەی هەوڵی سەربەخۆیی

کوردستانیش دەدات و دەیەوێ کوردیش وەک نەتەوەکانی تر ئازاد بن، بەلام ئەوەی ئەو لە سەرەتادا دەیەوێ و هەوڵی بۆ دەدات، بەپێچەوانەی پروپاگەندەکانی، ئازادی کورد و سەربەخۆیی کوردستان نییە، بەڵکو دامەزراندنی سۆسیالیزمە لە کوردستانی داگیرکەراوی تورکیادا. بۆ ئەوەی خوێنەران باشتر لە مەبەستی پ.ک.ک بگەن و بزانن پ.ک.ک چۆن و بە چ شێوەیەک کوردستان و کورد ڕزگار دەکات و هەوڵدانی ئەو چ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە مارکسیستیانە هەیە، کە بە ڕیفۆرمیستیان ناودەبات، باشترە گوێ بدەینە هەڤاڵ جومعە و بزانین ستراتیژی ڕێکخراوەکەیان بۆ ئازادیی کوردستان چییە:

**.. پ.ک.ک بۆ ئەوە دەرکەوتووە تاکو کێشەی سەربەخۆیی و ئازادی چارەسەر بکات. بۆ چارەسەربوونی کێشەی سەربەخۆیی و ئازادیش پێویستە کێشەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ڕێکخستن، سەربازیی، ئابووری و کۆمەلایەتی و تاکتیکی چارەسەر بکرێن. ئەگەر ئەو پرسانە چارەسەر نەکرێن، کێشەی سەربەخۆیی و ئازادی لە کوردستاندا چارەسەر نابێت(١).**

لە ڕوانگەی مارکسیست- لینینیستەکانەوە، چارەسەرکردنی کێشەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ڕێکخستن، سەربازی، ئابووری و کۆمەلایەتی مانای دامەزرانی سۆسیالیزم و سەقامگیربوونی سیستەمی سۆسیالیستی دەدات! ستراتیژیی پ.ک.ک لەم ڕوانگەیەوە، بەو مانایەیە، کە کورد دەبێ سەرەتا بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم هەوڵ بدات. هەر کە سۆسیالیزم لە تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا دامەزرا و سەقامگیر بوو و کێشەکانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ڕێکخستن، سەربازی، ئابووری، کۆمەلایەتی و تاکتیکەکانی چارەسەر کرد، ئینجا بگەڕێتەوە سەر باسی چارەسەرکردنی کێشەی سەربەخۆیی و ئازادی خۆی.

ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەیە کە: داخوا ئەو تیۆرییەی پارتی کرێکارانی کوردستانی لەسەر دامەزراوە و لە کۆنگرەی شەشەمیدا بە (ئاپۆیزم)ی ناساند، چ جیاوازییەکی لەگەڵ بۆچوونی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێشوو و پارتە کۆمۆنیستە هاوپەیمانەکانی لەو وڵاتانەدا هەیە، کە کوردستانیان لەنێو خۆیاندا دابەشکردووە؟ داخوا ئەوانیش ڕایان وا نەبوو، کە تەنیا سۆسیالیزم دەتوانی کێشەی نەتەوە کۆلۆنییەکان چارەسەر بکات؟ داخوا ئاپۆیزمیش هەر ئەو ڕایە دووپات ناکاتەوە و هەندێک گرفتی تریشی ناخاتە سەر؟ داخوا کاتێک لینین لە

١- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ٢ - ٣

سالی ۱۹۲۲دا فەرمانی دامەزرانی کوردستانی سووری پەسەند کرد و «لاچین» بوو بە پایتەختی، سۆسیالیزم کێشەکانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ڕێکخستن، سەربازی، ئابووری، کۆمەلایەتی و تاکتیکەکانی چارەسەر کردبوو؟

هەموو لایەکمان دەزانین کە سۆسیالیزمی بنیادنراوی لینین لە ماوەی 70 ساڵاندا نەیتوانی سەقامگیر بێ و کێشە ئابووری، کۆمەلایەتییەکان و ئازادییە دیموکراتییەکانی بۆ چارەسەر نەکرا. بۆیە مرۆڤ، بە تایبەتی ئەوانەی باوەڕیان بە دیالێکتیک هەیە، پێویستە هەندێک وردتر بیر بکەنەوە و وەک پێشینان وتەنی (بە مستە ئاوێک وەمەلە نەکەوێن). لە جیاتی خۆبەستنەوە بە دروشمی دڵخۆشکەرانەی نەگونجاو لەگەڵ بارودۆخی زەمان، کە ئەلف بێی تیۆری مارکسیستییە، ڕاستییەکانی ڕۆژ بسەلمێنن و بزانن لە دنیای ئەمڕۆدا چیچەنەکان و گەلانی باڵتیک و باڵکان و.... و تیمۆری ڕۆژهەلات لە ئەندونیزیا چۆن و بە چ شێوەیەک و لە چ سیستەمێکدا ڕزگار بوون؟ ئایا ئەو نەتەوانە بە دەست سۆسیالیزم ڕزگاریان بوو، کە کورد دامەزراندنی سۆسیالیزم وەپێش ڕزگاریی خۆی بخات؟

هەموو دەزانین کە سۆسیالیزم دیاردەیەکی فەرهەنگی، کۆمەلایەتی، ئابووری و سیاسییە، بە نەتەوەیەکی پارچە پارچەکراو دانامەزرێ، کە خاوەنی فەرهەنگ و ئابووریی لێک جیاوازە و زمانی یەکگرتووی نییە و دوژمن دەوری تەنیوە و هەر بەشەی دیلی دەستی داگیرکەرێکە و بە وتەی پ.ک.ک: **لەهەموو لایەکەوە نەزان و دواکەوتووە**(۲). بۆیە، ئەو تیۆرییەی کە ستراتیژی ئاپۆیزمی لەسەر دامەزراوە، لەگەڵ دۆزی کوردستان و ژیانی ئەمڕۆی نەتەوەی کورد یەک ناگرێتەوە و تاقیکردنەوەکان پیشانیان داوە، کە ناتوانێ خزمەتی بزووتنەوەی گەلی هەژاری ئێمە بکات و جیا لە ئاژاوە نانەوە لەنێو هێز و ڕێکخراوە سیاسییە کوردستانییەکاندا و قوولکردنەوەی کێشەی کورد، ناتوانێ ئاواتی نەتەوایەتی گەلەکەمان دەستەبەر بکات.

---

۲- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ۷۳

# ستروكتوری گروپی ئایدیۆلۆژی ئۆجەلان و پ.ک.ک

ستروکتوری گروپی ئایدیۆلۆژی و پ.ک.ک وەک هەموو ڕێکخراوە چەپ و مارکسیستییەکان لەسەر سەنترالیزمی دیموکراتیک بینات نراوە. بۆ ئەم مەبەستەش کۆنگرە، کۆنفرانس و کۆمیتەی جۆراوجۆری کار پێکدێنن. بەڵام سەرنجێکی تایبەتیان داوە بە سەنترالیزمەکەیان و بەشە دیموکراتییەکەیان لاواز کردووە. لە چوارچێوەی سەنترەکەشدا ڕۆڵی سەرۆک لە سەرووی پارتی دەبینن و بەمجۆرە پ.ک.ک یان لە پرەنسیپی ڕێکخراوەیەکی مارکسیستی دەرهاویشتووە. بەگشتی، نەتەوە، نیشتمان و ڕێکخراوەکەیان بە وجودی سەرۆک بەستووەتەوە. بۆ وێنە دروشمی «ئۆجەلان- کوردستان» لەو فکرە چەوت و نادیموکراتییەوە سەرچاوەی وەرگرتووە.

لە پ.ک.کدا سەرۆک بڕیار دەدات و هەموو کادیر و ئەندامان، چ ئەوانەی لە کۆنگرەکاندا بۆ ڕێبەرایەتی هەڵدەبژێردرێن و چ ئەوانی تر، پێویستە بەبێ پرس و ڕامان، فەرمانەکانی بەجێ بێنن و کەس مافی ئەوەی نیە لە بەرامبەر فەرمانەکانیدا لاوازیی و دوو دڵی پێشان بدات. تەنانەت هیچ کەس لە پ.ک.ک دا وەرناگیرێ و بە پ.ک.کیی ناناسرێ هەتا خۆی لە جەستەی سەرۆکایەتیدا نەدۆزێتەوە. هەفاڵ جومعە سەبارەت بە ڕۆڵی سەرۆکایەتی لە پ.ک.ک دا دەڵێ:

**سەرۆکایەتی ئێمە لە سەرەتاوە تیۆری شۆڕشی نوسیوە و گروپی دامەزراندوە و هەر بۆخۆشی ئەو گروپەی پەروەردە کردووە. تاوەکوو ئەمڕۆش سەرۆکایەتی هەر بۆخۆی سەرکێشی ئەم بزووتنەوەیە دەکات.... کاتێک ئەمر و تەعلیمات دەهات بۆ ئێمە بەس بوو. یەکسەر کاری خۆمان ئەنجام دەدا و بێ ئەوەی هیچ گفتوگۆیەکی لەسەر بکەین. ئەمەش لایەنێکی گرنگە لە پ.ک.ک دا(١).**

---

١- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ١٢٣

باوەڕپێهێنان بە سەرۆکایەتی لە پ.ک.کدا دیاردەیەکی ناسایی نیە. کە مرۆڤ بەچەشنی ڕێکخراوەکانی تر سەیری بکات، سەرۆک لە پ.ک.کدا لەسەرووی پارتییە و تەنانەت کەسێک بە ئەندامەتی پ.ک.ک وەردەگیرێ کە سەرەتا سەرۆکایەتییەکەی قەبووڵ بکات و هەروەکوو گوتم خۆی لە جەستەی سەرۆکەکەیدا بدۆزێتەوە و ئەو لە سەروی ڕێکخراوەکەدا ببینێ. هەڤاڵ جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**- .... بە دەگمەن لە پارتییەکدا سەرۆکایەتی لە هەنگاوی یەکەمدا قەبووڵ دەکرێت. سەرنج بدەنە سەرۆکایەتی لینین، هەتاکو ساڵی ١٩١٢ لە دوایە سەرۆکایەتی لینین قەبووڵ دەکرێ. ڕاستە لە گرووپی بۆلشۆویکدا قەبووڵ دەکرێ. بەڵام لە پارتی کۆمونیستی ڕووسیادا نییە. بەڵام لە مێژووی ئێمەدا هەرلە ڕۆژی یەکەمەوە تاوەکوو ئەمڕۆ سەرۆکایەتی قەبووڵ کراوە(٢). لەم ڕوانگەیەوە: ... کە هاتیە ناو پارتی، خۆت و ئیرادەی خۆت دەدەیە دەست پارتی. تۆ دەڵێی من هاتووم ئەرک و کار لە کوێیە و من بچمە هەرکوێیەک، ئامادەم بە گوێرەی بەرژەوەندی پارتی کار بکەم. مانای مرۆڤی پارتی ئەمەیە و جگە لەمە قەبووڵ ناکرێت(٣).**

وەک هەڤاڵ جومعە دەنوسێ، لە پ.ک.کدا سەرۆک دەتوانێ ئاڵوگۆڕ لە بڕیارەکانی کۆنگرەدا پێک بێنێ و تەنانەت هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیش لە کۆنگرەکاندا دیاردەیەکی ڕەواڵەتین و هەرکاتێک سەرۆک بخوازێ، دەتوانێ وەلایان نێ و کەسانی تریان لەجێ دانێ. بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستییە با سەرنج بدەینە پەسەندکراوێکی کۆنگرەی دووهەمی پ.ک.ک:

**... کۆمیتەیەکی ناوەندی هەڵبژێردرا، بەڵام ڕەسمی نەبوو. بۆ ئەوەی ببێتە ڕەسمی پێویست بوو ساڵێک خەبات بکات و لە کرداردا خۆی بسەلمێنێ. دەسەڵاتی ئەمەش درا بە سەرۆکایەتی، واتە تەنیا ئەندامەتی سەرۆکایەتی ڕەسمی بوو و ئەوانیتر هەموویان ناڕەسمی بوون. شتی وا تەنیا لە ناو پ.ک.ک دا دەبینرێ و لە مێژووی پ.ک.ک دا هەیە. چونکە لە پ.ک.ک دا سەرکردایەتی مەسەلەی شۆڕش و پارتی لەسەروی هەموو شتێک دادەنێ تاکوو پارتی و شۆڕش نەکەونە مەترسی(٤).**

ئۆرگانیزە کردنی پ.ک.ک بە شێوەی دامەزراندنی دەفتەری سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی لە سەر کاغەز، بەو مانایە نیە، کە سەرۆک و ئەندامانی پ.ک.ک باوەڕیان بەو ئۆرگانانە و بڕیاردانی بە کۆمەڵ هەبێ، بەڵکو ئەوان باوەڕیان بە کار و

---

٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٤٤

٣- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٤٦

٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەکانی ١٤٦، ١٤٧ و ١٤٨

پراکتیکی بەکۆمەڵە. بەو مانایە سەرۆک بڕیار دەدات و ئەوانی تر بڕیارەکەی بەجێدەکەیەنن. بە کورتی مرۆڤ دەتوانێ ستروکتوری پ.ک.ک لە بەرامبەر ستروکتوری سیستەمێکی ئایینی و عەشیرەتی دانێ و بە یەکەوە هەڵیانسەنگێنێ. توجەلان لە پ.ک.کدا خۆی وەک پێغەمبەرێک دەبینێ، کە خودا لە سەر پ.ک.ک ی داناوە و دوای نەمانیشی کەس جێگەی ناگرێتەوە. بۆ زانیاری پتر لەو مەبەستە باشترە گوێ لە خۆی ڕاگرین تا بزانین لە وەلامی پرسیاری «نبیل ملحم» نوسەری کتێبی «سبعە ایام مع آپو» (حەوت ڕۆژ لەگەڵ ئاپۆ)دا، کە سەبارەت بە ستروکتوری پ.ک.ک پرسیاری لێ دەکات، چ وەلامێک دەداتەوە. نبیل ملحم دەپرسێ:

- « لە حیزبە چەپەکاندا کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی و دەبیری گشتی هەیە. لە حیزبە بورژواییەکانیشدا، شێوەی هیرەمی (کەلە قەندی) هەیە، بەلام پ.ک.ک دەفتەری سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی نیە و ئەوە سەرۆکە کە گشت سیفەتەکانی تیدا کۆبووەتەوە. بۆ من تێگەیشتنی فەلسەفەی ئەم شێوەکارە سەختە، دەکرێ لەم بارەیەوە، ڕوونم کەیەوە؟»

باشە. ڕەنگە ئەمە سەرەتایەکی باش بێ. با پێت بڵێم، من هەرلە سەرەتاوە بڕوام بە شێوازی دامەزراندنی حیزبە کۆمۆنیستەکان و حیزبە سەرمایەدارییەکان لەم قۆناغەدا نەبووە. بۆ ئێمە دەرفەتی دەست بەکار بوون بە شێوەی ڕابردوو نەبوو و ئەو شێوەکارە سەرنجی منی بۆلای خۆی ڕانەکێشا. دەفتەری سیاسی، کۆمیتەی ناوەندی و تەنانەت پلەی دەبیری گشتیش لە ڕوانگەی ئێمەوە ناو و پلەی ڕەواڵەتین. چونکە، ئەو ناوانە نەک هەر کارگەر نەبوون، بەڵکو دەرفەتیان بۆ هەڵپەرەستی و بوروکراسی ڕەخساند. ئەوەی لەو پلە و پایانەدا جێدەگرێ، هەر لە دووهەم ڕۆژدا هەست دەکا خۆی زایە کردووە. ئێمە لە ماوەی ساڵانی دوور و درێژدا ئەو مەسەلانەمان ڕوون کردووەتەوە. دەمەویست دەفتەری سیاسی و کۆمیتەی ناوەندییەکی بەهێزمان هەبێ و منیش لە پلەی دەبیری گشتیدا بم و دوو یاریدەدەرم بێ و جێگای خۆم باش بگرم، بەلام وەک دەرکەوت، ئەو دەفتەر و ناوانە سەرکەوتوو نەبوون و ئەوکەکانی سەرشانی خۆیان باش ڕانەپەڕاند. ئەوانە چەند نمونەیەکن و هەروەک دەبینی من دەمەوێ نمونە بێنمەوە. نمونەی شێوەکاری پێغەمبەرەکانت بۆ دێنمەوە و من لە شێوەکاری پێغەمبەرەکان ڕێباز و شێوازی خۆم وەردەگرم. شێوازی وتووێژ و باس (پانێل یان حیوار) کە لە لایەن گەورەی ئێمە عیسا درودی خوای لێ بێ و هەروەها بنیاتی جێگرەکان (خەلیفەکان) لە لایەن محەمەدەوە

**(س). ئەو شێوەکارانە زۆر گورج و گۆلتر و کاراترن لە دامودەزگای دەفتەری سیاسی(٥). "نبێل ملحم" هەروەها لە ئۆجەلان دەپرسێ:**

- ‌- نیستاش دنیا لە تەنگژەی ڕێکخراودا دەژی و کەس ناتوانی کە بڵێ ڕێگا چارەسەرێکی بۆ ئەم گێروگرفتە دۆزیوەتەوە و لە ڕیزی ئەواندا ئەتۆ... کەسێکی خاوەن بەهرەی خوداپێداو و دەگمەن بە ناوی ئاپۆ هەیە کە خاوەن خووخەدەی تاکە کەسی و تایبەتییە و لە بارنەی دەگمەنەکان دایە. بەلام کەسایەتی دووهەم لە حیزبەکەتدا کێ یە؟ و مەودای نەفەری یەکەم و دووهەم چەندە و ئەگەر نەفەری یەکەم ئەما کە هۆیەکانی ئەمان زۆرن و لەوانە هۆی سروشتی یان ناسروشتی (سەرووی سروشت) کێ جێگەی ئاپۆ دەگرێتەوە؟"

**مەسەلەی گرنگ بەلامەوە ئەمەیە کە نەفەری دووهەم لەمەوبەدوا پەیدا نابێ و هەرگیزیش نابێ پەیدا بێ و نابێ سەردەرخا(٦).**

پ.ک.ک دوو ئۆرگانی بە ناوەکانی (ERGK) و (ERNK) هەیە. "ئەرگەکە" باڵی سەربازیی پ.ک.ک یە، کە "گریلا"ی پێدەڵێن و ئەرنەکەش (ئەرتەشی ڕزگاری نەتەوەیی) ڕێکخراوی ئەورووپایەتی. ڕێبەرایەتی پ.ک.ک بۆ ئەوەی بەهرە لە کار و وزەی ئابووریی کوردە نیشتەجێبووەکانی نیشتەجێی ئەورووپا وەرگری، ئەرنەکەی کردووەتە بەردەیەک لە خۆی و کوردە پەنابەرەکانی دانیشتووی ئەورووپا، بە واتەیەکی تر وەک بۆخۆی دەڵێ بەردەیەک لەنێوان پ.ک.ک و کوردە بۆرژواکاندا.

کوردەکانی نیشتەجێی ئەورووپا لە سەرەتای دامەزرانی ئەرنەکەوە لە ئەورووپا هەتا نیستا بە ئەزموون وەرگرتن لە ژیانی دیموکراتی و پاراستنی مافی سیاسی گەلان، هەوڵی دیموکراتیزە کردنی پ.ک.ک یان داوە و تەنانەت لەو ڕێگایەدا ژمارەیەکیشیان بەدەست لێپرسراوانی پ.ک.ک شەهید کراون. ئەوان بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان توانیویانە بە فیداکاری خۆیان، هەستی نەتەوایەتیی ئەرنەکە بەسەر هەستە چینایەتییەکەیدا زاڵ بکەن. لەژێر تیشکی ئەو کارتێکردنەدا، "ئەرنەکە" بە پێچەوانەی ئامانجی پ.ک.ک کە بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم هەوڵ دەدات، وزە و توانای خۆی پتر خستووەتە سەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد. ئەم

---

٥- وتوویژی نبیل ملحم لەگەڵ عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە کتێبی حەوت ڕۆژ لەگەڵ ئاپۆ ڕابەر و گەل. چاپی یەکەم ١٩٩٦، بڵاوکراوەی مەڵبەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاتین، لاپەڕەی ١٩٩-٢٠٠

٦- هەمان سەرچاوە لاپەڕەکانی لاپەڕەی ٢٠٩- ٢١٠

ڕەوتە ڕێبەرایەتی پ.ک.ک ی نیگەران کردووە. لەبەر ئەوە، هەڤال جومعە ئەو دیاردەیە ئاشکرا دەکات و دەڵێ:

**- ئێمە باش دەزانین لە چالاکیەکانی ڕێکخستنی جەماوەری (ERNK) دا ئێوە چ دەکەن و چ دەڵێن! پێتان وانەبێ نازانین. زۆر باش ئاگامان لێتانە و دەزانین هەرچی دێتە سەرزمانتان نایگێڕنەوە و دەیڵێن و نەک تەنیا بەگوتن بەڵکوو لە کرداریشدا بەمجۆرەیە. بۆیە لە کۆنترایەک زیاتر زیان بە گەل و پارتی دەگەیەنن(٧).**

کردەوەکانی ئەرنەکە بە شێوەی سروشتی تەشەنەیان کردووەتە ناو هەموو ئەندامانی پ.ک.ک و ترسیان لە دڵی ئۆجەلانی خستووە، کە ئەکات کردەوەی ئەوان رووخانی قەوارە و ستروکتوری پ.ک.ک ی بە دواوە بێ، لەبەر ناوی کۆنترا گریلا لەسەر ئەرنەکە دادەنێ و دەربارەی ئەندامانی تری پ.ک.ک ش دەڵێ:

**- هەرکەسێک کە جێگای خۆی لەناو پ.ک.ک دا گرتووە هەوڵ دەدا ڕاستی پ.ک.ک بگۆڕێ و ڕاستی خۆی بخاتە شوێنی، ڕاستی کەسایەتی خۆی بکاتە ڕاستی پ.ک.ک. لە بەرامبەردا پ.ک.ک ش داکۆکی لە ڕاستی خۆی دەکات و بەڕێوەی دەبات. لەو چاخەدا لە سەردەمی گرووپی سەرەتایی گیانێکی هەڤاڵبەندی وا تونوتۆڵ هەبوو کە ئێستاکەش پ.ک.ک بەڕێوە دەبات، کەچی ئێستا گیانێکی تر دروست بووە، لە ناو پ.ک.ک دژ بە پ.ک.ک. لەم گیانەشدا چ هەیە؟ فیتنە و فەسادی و دووڕوویی و ساختەکاری و ماستاو سارد کردنەوە و... هتد. بە مانایەک کە هەرکەس زیاتر فێڵبازی بکا، ئەوە دەبێتە پ.ک.ک یی، ئەمەش مەترسییەکی گەورەیە(٨).**

---

٧- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ١٢١
٨- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٢٢

# گروپی ئایدیۆلۆژی پ.ک.ک لە پراکتیکدا

خەباتی گروپی ئایدیۆلۆژی پ.ک.ک بەکردەوە. لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد، کە ئۆجەلان بڕیاریدا گروپ بچن لە کوردستان جێگیر بن. بۆ ئەنجامدانی ئەوە، ئەندامانی گروپی لە عەنتاب، دیرسیم، دیاربەکر، ئاگری، قارس و باتمان جێگیر کرد و بۆخۆشی لەگەڵ پیلوت، عەبدولرەحمان و فاتمە کە بە گوتنی جومعە هەرسێ کەسیان سیخوڕی دەوڵەت بوون، لە ئەنکارا مایەوە.

گروپ هەرکە پێی گەیشتە کوردستان، ئەرکی سەرەکی خۆی لەسەر شەڕ دژی حیزب و ڕێکخراو و گروپە مارکسیستی و نەتەوەییەکان دامەزراند. لە ڕاستیدا گروپ بۆ ئەو مەبەستەش گەڕایەوە کوردستان، کە ئەندامانی سەر بە ئایدیۆلۆژییەکانی تر لەنێو بەرێ، کە بەداخەوە لەو ڕێگایەدا زیانێکی گەورەی بە بزووتنەوەی ئەو ڕێکخراوانە گەیاند، کە دژی دەوڵەتی تورکیا خەباتیان دەکرد. هەڤاڵ جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**- ئەرکێکی سەرەکیمان ئەوە بوو، کە لەگەڵ تەواوی فکر و ئایدیۆلۆژییەکانی تر شەڕ و ململانێمان کردبایە و لەم شەڕەشدا ئەنجامێکی مسۆگەرمان بەدەست هێنابا. واتە پێویست بوو ئایدیۆلۆژی پ.ک.ک بکەوێتە بواری کردار و لە پراکتیکدا خۆی بسەلمێنێ و سەقامگیر بێت(١).**

گروپی ئایدیۆلۆژی بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٧٦دا، کۆبوونەوەیەکی ڕەسمی لە گەڕەکی «دیکمان» لە ئەنکارا پێکهێنا. لەو کۆبوونەوەیەدا ئۆجەلان پێشنیاری کرد، گروپ کۆمیتەیەکی ناوەندی پێک بێنێ و ئەو کۆمیتەیە گروپ هەڵسوڕێنێ و کارەکانی بەڕێوەبەرێ و لە چوارچێوەی تاکەکەسی دەربچێت(٢).

ئۆجەلان بەم مەبەستە دوو یاریدەدەر بە ناوەکانی حەقی قەرار و قەمەر ئۆسقان

١- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ١٣٢
٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٤٤

بۆخۆی هەڵبژارد. ئەو دوو کەسە بە ناوی کۆمیتەی ناوەندی پارمەتی ئۆجەلانیان هەڵبژارد. قەمەر ئۆسقان لە دیرسیم ئەرکی گرووپی بەڕێوە دەبرد، بەڵام چونکە کارەکانی بە دڵی ئۆجەلان نەبوو، لە بەرپرسایەتی خست. قەمەر ئۆسقان لە بەرامبەر ئەو گردەوەیەی ئۆجەلاندا، پ.ک.ک ی بەجێ هێشت و لەگەڵ چەند کەسێکی تر بزووتنەوەی «تێکۆشین»ی دامەزراند، کە ئەویش گرووپێکی مارکسی بوو، بەڵام بە فەرمانی ئۆجەلان لە دیرسیم تیرۆر کرا و گیانی لە دەست دا(٣).

گرووپی ئایدیۆلۆژی بۆ جاری دووەم لە سەری ساڵی ١٩٧٧، لە ماڵی پیلۆت لە ئەنکارا کۆبووە. لەم کۆبوونەوەیەدا گشت گۆڕانکارییەکانی دوای کۆبوونەوەی دیکمان تاووتوێ کرا و هەڵە و کەموکورییەکانی نێوان دوو کۆبوونەوەی گەڕەکی دیکمان و ماڵی پیلۆت کەوتنە بەرباس و لێکۆڵینەوە و بۆ قۆناغی دوایش بڕیار وەرگیرا. پێشتر ئاماژەم بە پیلۆت کرد و گوتم هەڤاڵ جومعە دەڵێ ناوبراو سیخوڕی میت بووە، لەبەر ئەوە پێویستە مرۆڤ بزانێ، ئۆجەلان کە بەو ڕاستییەی زانیوە، بۆچی و بە چ مەبەستێک لە ماڵی ئەودا گرووپەکەی کۆ کردووەتەوە و ئەو دیاردە گرنگانەی خستووەتە بەرباس؟ هەڤاڵ جومعە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەنووسێ:

**- سەرۆکایەتی بە ئەنقەست ئەم کۆبوونەوەیەی لەوێ سازکرد، بۆ ئەوەی دەوڵەت لێمان نەکەوێتە گومان و هەروا دڵنیا بێ کە ئێمە لەژێر چاودێری ئەودا کۆبوونەوە ساز دەکەین و دەجوڵێینەوە. .... سەرۆکایەتی لە شیکردنەوەکانیشدا باسی ئەم شتە دەکات و لەسەر ئەم کۆبوونەوەیە ڕادەوەستێ. واتە دەوڵەت بەهۆی پیلۆت ئاگاداریی لەم کۆبوونەوەیە هەبوو و دەیزانی کە لە ماڵی ئەویشدا دەبەستریێ، چونکە پیلۆت سیخوڕی ڕژێم بوو و ڕۆژانە زانیاری لەسەر ئێمە دەدایە ئەوان. تەنانەت دەوڵەت تا ئەوکاتە و لەوەش بەدواوەش هەر دەیگوت: «ئاپۆ لە دەستی ئێمەدایە و هەرکاتێ بمانەوێ، دەتوانین بیگرین و لە سێدارەی بدەین». تا ئەو ڕادەیە باوەڕیان بەخۆیان هەبوو و لە پلانی خۆیاندا دڵنیا بوون. ئەمەش ڕاست بوو، سەرۆکایەتی لەدەستی ئەواندا بوو، چونکە لە سێ لاوە چاوەدێری دەکرا، لە لایەک فاتمە و لە لایەک پیلۆت و لە لایەکی تریش عەبدولرەحمان. بەم شێوەیە بەتەواوی کۆنترۆڵی دەوڵەتی لەسەر هەبوو.... لەم کۆبوونەوەیەدا من (هەڤاڵ جومعە) ئامادە نەبووم و ئەوکاتە لە عەنتەب بووم. لەم کۆبوونەوەیەدا هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی لە دوای کۆبوونەوەی دیکمان دروست ببوو، تاووتوێ کرابوون. هەروەها لەو ماوەیەدا چ ئەنجام و هەڵە و کەموکەسییەک دەرکەوتبوون، هەموویان خرابوونە بەرباس و**

---

٣- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٤٦

**لێکۆڵینەوە و کۆبوونەوە لەسەریان ڕاوەستابوو. لەوە گرنگتر ئەوە بوو کە ڕوون کرایەوە لەمەو بەدواوە چ مەترسییەکمان دێتە ڕێگە و لە بەرامبەریدا چ تەدبیرێک پێویستە وەرگرین. ئەم کۆبوونەوەیە بۆ ئەوە سازکرابوو کە ڕوونی بکەینەوە لەم قۆناغە بەدواوە، چۆن خەبات بکەین و بە چ شێوەیەک بزووتنەوە بەڕێوە ببەین(٤).**

گروپ دوای کۆبوونەوەی ماڵی پیلۆت دەست دەکات بە جێبەجێ کردنی بڕیارە پەسەند کراوەکانی کۆبوونەوە. ئەو بەشەی کە دەگەڕێتەوە کوردستان، دەستبەجێ پەلاماری ئەو گروپ و ڕێکخراوانە دەدات، کە بەنهێنی دژی دەوڵەتی تورکیا خەباتیان دەکرد و لە ئاکامدا حەقی قەرار، کەسایەتی دووەمی گروپ، کە جێگری ئۆجەلانیش بوو، ڕۆژی ١٨/٥/١٩٧٧، لە شەڕی دژ بە گرووپی (ستێرکا سۆر)، لە بازارچێکی سەر بە عەنتاب شەهید بوو. بەمجۆرە ئۆجەلان هەردوو جێگرەکانی لە دەست دا و گروپیش بەبێ کۆمیتەی ناوەندی مایەوە. ئەندامانی گروپ لە درێژەی ئەو ململانەیەیدا، کەوتنە شوێن ئەندامانی ستێرکا سۆر. سەرەتا عەلائەدین کاپلانی سەرۆک و پاشان بۆزان ئەسلان و محەمەد ئۆزوون و سەرئەنجام یەک یەکی ئەندامانی ستێرکا سۆریان کوشت و دووچاریش ژنی عەلائەدین کاپلانیان بریندار کرد. هەقاڵ جومعە دەربارەی کوشتنی ئەندامان و ڕێبەرایەتی ستێرکا سۆر دەڵێ:

**.... سەرەتا عەلائەدین کاپلانمان لەناو برد و پاشان یەک یەکی ئەوانی ترمان لە عەنتاب و الازیغ لەناو برد. بەم شێوەیە کۆتاییمان بە ستێرکا سۆر هێنا(٥).**

سەرەتای ١٩٧٨، گرووپێک لە ئەندامانی ڕێگای ئازادی (DDKD) دەچنە ناو گرووپی ئۆجەلانەوە، بەڵام چونکە پێکەوە ناسازێن، لێیان جیا دەبنەوە. ئەو جیابوونەوەیە، بە ڕەواڵەت گرووپی ئۆجەلان تووڕە دەکات و بەم بیانووەوە کە ئەوانە سیخوڕی ڕێگای ئازادی بوون و بۆ سیخوڕی کردن چوون لە گرووپەکەیانەوە، هەموویان کوشتن و شوێنەواریان نەهێشتن.

گروپ هەر لەو ساڵەدا دژی ڕزگاری گەل (H.K.H) ڕاپەڕی و لە شەڕ و ململانەیەکی نابەرامبەردا، زۆربەی ئەندامانی ئەو گرووپەشی کوشت و بڵاوەی بە ئەندامانی کرد و لە ئاکامی تێکهەڵچوونەکانیشدا ١٥ ئەندامی خۆی لە دیاربەکر بەدەستی ئەندامانی ڕزگاری کوژران(٦).

---

٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەکانی ١٤٦، ١٤٧ و ١٤٨.
٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٨٢
٦- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٩٢

سالی ١٩٧٨ گروپێکی مارکسیستی بە ناوی تێکۆشین لە ناوچەی عەنتاب دامەزرا. ئەو گروپە، لەسەر دەسەڵات لەگەڵ گروپی ئۆجەلان دەمەتەقەی لێ پەیدا بووە. گروپی ئۆجەلان سەرەتا بە ڕێگای سیاسی داوای لە ئەندامانی تێکۆشین کردووە خۆبەدەستەوە بدەن. بەڵام چونکە ئەوان ئامادە نەبوون، بڕیاری کوشتنیان داون و بۆ ئەمەش کەوتوونەتە شوێنیان و هەموویان لە عەنتاب و جێگەی تر کوشتوون(٧).

گروپی ئۆجەلان هەروەها لە کۆتایی سالی ١٩٧٨دا لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان (کوک) ڕاسا و لە شەڕێکی خوێناویدا دژی ئەو ڕێکخراوە کە سالێکی خایاند. نزیکەی ٢٠ کەسی لە هەردوو لای شەڕەکە بەکوشت دا.

گروپی ئۆجەلان دوای کۆتایی هێنان بەو گروپانە کەوتە گیانی عەشیرەتەکان و بۆ چاوترساندنی کەل و عەشیرەتەکان. فەرمانی تیرۆری سلیمان سەرۆکی عەشیرەتی سلیمانانی دا و گروپەکەی بە نیزی نیوەڕۆ لە گوندی حیلوان، سلیمانی کوشت. جومعە دەربارەی کوشتنی سلیمان دەڵێ:

**هەڤاڵان چوونەوە حیلوان و پاش ماوەیەک چالاکییەکە جێبەجێ کرا. ئەم چالاکییە بە ڕۆژی نیوەڕۆ لە ناوەندی حیلواندا بەڕێوەچوو. ئێمە ئەو چالاکییەمان زیاتر بە شۆڕشگێڕانی سەردەمی گروپی ئایدیۆلۆژی کە هەموویان ناشارەزا و ناماتۆر بوون و زیاتر بە دڵ کاریان دەکرد تا مێشک. پێکهێنا(٨).**

لەو سەروبەندەدا، ئۆجەلان ئەنکارا بەجێ دێلێ و دێت لە دیاربەکر نیشتەجێ دەبێ و دەیەوێ، گروپەکەی شان بە شانی ئەو خوێنرشتنانەی و کوشتنی سەدان کەس لە ئۆپۆزیسیۆنی ڕقەبەری دەوڵەتی تورکیا، کۆنگرەی پێکهاتنی پارتی ببەستێ و بە بەڕێگای بەستنی گۆنگرە، پارتی کرێکارانی کوردستانی ڕابگەیەنێ. ئۆجەلان بڕۆگرامی پارتی دەنوسێ، بەڵام بۆ ئەوەی دوای تەواوبوونی کۆنگرە، پارتییەکەی ڕابگەیەنێ، پێویستی بە چالاکییەک دەبێ، تاکو لەگەڵ بلاوکردنەوەی هەواڵی چالاکییەکە، دامەزراندنی پارتییەکەشی جاڕ بدات. هەڤال جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**.... پێویست بوو چالاکییەکمان لە دژی دواکەوتوویی و کۆنەپەرەستی کورد بەڕێوە بردبا، یان لە دژی دەوڵەت چالاکییەکمان کردبا و بەم شێوەیە دامەزراندنی پارتیمان جاڕ دابایە. بەڵام بۆ دەوڵەت هێشتا زوو بوو. ئەگەر لە دژی دەوڵەت کارێکی وامان کردبا، لە**

---

٧- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٢٤٥

٨- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٢٢١

زێری دەرنەدەکەوتین، بۆیە فیوّدالیزمی کورد بۆ ئێمە بەشتر بوو. لە حیلوان هێندێ ئەزموونیشمان وەدەست کەوتبوو(٩).

شایانی باسە بەر لە بەستنی کۆنگرە لە نێوان ئەندامانی گروپی نۆجەلاندا کێشەیەکی نوێ لەسەر کەسایەتیی ناوبراو سەری هەڵداوە. باقی (سلێمان) برای حەقی قەرار و فاتمەی خێزانی نۆجەلان هەرکام بەشێوەیەک ویستویانە نۆجەلان لە سەرۆکایەتی بخەن و بۆخۆیان جێی بگرنەوە. جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

دژی سەرۆکایەتی گەلێک پروپاگەندەیان دەکرد، دەیانگوت: .شێتە، بێ شەرەفە، یان هەندێکیان بە بەهانەی فاتمە دەیانگوت سیخوڕە..... سلێمان تۆڵەی خوێنی براکەی لە ئێمە دەخواست... کە دەیبینی فاتمە دەخوازێ پارتی بخاتە دەستی خۆی. دەیگوت: .مافی منە. من برای حەقی قەرارم.... فاتمەش دەیگوت: .مافی منە، چونکە من ژنی سەرۆکایەتیم و نزیکی سەرۆکم(١٠). گروپ سلێمانی وەلا نا و بۆ خۆدەربازکردنیشی لە دەست فاتمە، پیلانی کوشتنی داڕشت، بەڵام تێیدا سەرنەکەوت.

٩- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٢٥٢
١٠- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ١٩٥-١٩٦

## دامەزرانی پارتی کرێکارانی کوردستان

گرووپی ئایدیۆلۆژی پێویستییەکانی کۆنگرەی ئامادە کرد و ڕۆژی ١٩٧٨/١١/٢٧ یەکەمین کۆنگرەی خۆی لە ماڵی «سەیفەدین زوزرلوو» لە گوندی «فیس» لە دەوروبەری دیاربەکر پێکهێنا. بەشدارانی کۆنگرە، ٢٠-٢٣ کەس بوون. بە وتەی هەڤاڵ جومعە، چونکە ئەندامان شارەزاییان لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کۆنگرە نەبوو، ئۆجەلان بۆخۆی کۆنگرەکەی بەڕێوە برد و ٩٠ ی قسەکانی کۆنگرەش لە لایەن ناوبراوەوە کراون و هەر ئەو بۆخۆیشی ناوی پارتی کرێکارانی کوردستانی لەسەر گرووپە ئایدیۆلۆژییەکەی دانا.

عەبدوڵڵا ئۆجەلان، محەمەد قەرە سونگور، شاهین دونمەز، مەزلوم، کەسیرە (فاتمە)، خەیری و جومعە بۆ کۆمیتەی ناوەندیی دیاری کراون. لەنێو ئەوانەدا، عەبدوڵڵا ئۆجەلان، محەمەد قەرە سونگور و شاهین دۆنمەز بەرپرسایەتی لیژنەی باڵایان پێ سپێرا و ئۆجەلان بوو بە سکرتێری پارتی. هەڤاڵ جومعە دەربارەی کۆنگرەکەیان دەڵێ:

**- حەوت هەڤاڵ کەوتنە ناو کۆمیتەی ناوەندی، لە ناو ئەو کۆمیتەیەشدا پێویست بوو لیژنەی باڵا (بەڕێوەبەر) دروست بکرێت کە لە سێ هەڤاڵ پێک دێت. سەرۆک و هەڤاڵ محەمەد قەرەسونگور و شاهین کەوتنە ناو کۆمیتەی ناوەندی. ئەوکاتە هەڤاڵ محەمەد قەرەسونگور بەهۆی ئەوە کە لە سیقەرەک ئامادەکاری پڕوپاگەندەی سیاسی دەکرد، لە کۆنگرە بەشداری نەکرد. هەروەها هەڤاڵ کەمال پیریش کە لە زینداندا بوو، نەیتوانی بەشدار بێت. وەکی تر هەڤاڵان هەموویان ئامادەی کۆبوونەوە بوون و ئەندامانی کۆنگرە ٢٠-٢٣ کەس دەبوو. لەمانە یەکێک بە خیانەت دەرکەوت و دوای کۆنگرە ڕای کرد و بۆمان دەرکەوت کە بەکرێگیراوی ڕژێم بووە. هەروەها شاهینیش کە لە دواییدا تەسلیم**

بوو، چونکە ئەمە ئەوەی لە هەمووی لەگەڵ پەرلی هەموو و شۆڕشگێڕانی جوتیەر هەڵبوێر کرد(١). بۆ ئاگاداری، شاهی بۆمەر خۆی تەسلیم دەکرد بوونەوە. بەڵکو دوای کۆنگرە لە الاربع گیراوە بەلام چونکە لە ڕەمەداندا ئاشتی دەبینا. هەیبیەکانی پارتی و کۆنگرەی داوەتە دەست پۆلیس.

پ.ک.ک لە یەکەم هەنگاویدا بۆ ڕاگەیاندنی ئاکامی کۆنگرەکەی و پارتی بوونی. بەهاری دا محەمەد جەلال بوجاق سەرۆکی عەشیرەتی سیفەرەک دەکوژێ و بە کوشتنی ئەو پارتی بوونی خۆی جاڕ بدات. پ.ک.ک بەم مەبەستە بوجاقی کە دۆست و لایەنگری شۆڕشی کوردستان بوو، خستە ژێرچاودێری و لە هەلێک دەگەڕا بۆ لێدان و کوشتنی، کە ڕۆژی ٢٠/٧/ ١٩٧٩، محەمەد فەرەسونگوریان ئاگادار کرد، محەمەد جەلال بوجاق هاتووەتە گوندی «قرباشی» سەر بە هیلوانە. ناوبراو دەستبەجێ گرووپەکەی هەڵگرت و بۆ کوشتنی بوجاق چووە ئەو گوندە.

جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

... ئەم گوندە کە لەسەر ڕێگەیە، محەمەد جەلال بوجاق و پیاوەکانی هەفتەیە لەم شوێنە. هەڤاڵان خەبەریان وەرگرتبوو کە ئەمە هەفتەیەکە ئەوێ و بەکەمەر بێ پیلان و ئەندامەکانی چووبوون بۆ جێبەجێ کردنی ئەم چالاکییە..... بێگومان هەڤاڵ محەمەد فەرەسونگور بۆخۆی لەسەر ئەم گرووپە بوو..... محەمەد جەلال بوجاق و پیاوەکانی لە ماڵێکدا دەبن، هەڤاڵانیش دەوری ئەو ماڵە دەگرن پێیان دەڵێن: «خۆتان بدەنە دەست». پیاوەکانی محەمەد جەلال بوجاقیش هەموویان بە چەکی گەورە بەکەمەر وەڵامیان دەدەنەوە و شەڕ دەست پێ دەکات. هەڤاڵانیش بە بۆمبا وەڵامیان دەدەنەوە. لەو شەڕەدا کەڵێک پیاوی محەمەد جەلال بوجاق دەکوژرێن و بۆخۆشی بریندار دەبێت و خۆی لەژێر لەرمەکان دەشارێتەوە و بەم شێوەیە خۆی ڕزگار دەکا(٢).

پ.ک.ک دوای بەجێگەیاندنی ئەو بڕیارەی، بەیاننامەیەکی نووسی و ڕۆژی ٢٠/٧/١٩٧٩، بە بریندار کردنی محەمەد جەلال بوجاق سەرۆکی عەشیرەتی سیفەرەک و کوشتنی ژمارەیەک لە هاوڕێیانی، پارتی بوونی خۆی ڕاگەیاند. پ.ک.ک لە بەشێکی تری بەیاننامەکەیدا دەربارەی شەڕ دژی ڕێکخراوە سیاسییەکان دەڵێ:

- ...... ئەو ڕێکخراوە بۆرژوا بچووکانەی کە لە باکووری ڕۆژئاوای کوردستاندا خەبات دەکەن وەک بزووتنەوەی کولتووری شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵات (DDKD)، ڕێکخراوی کاوە

---

١- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ٢٥٨

٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٢٨٩

(KAWA)، رزگاری گەل (HKH) و ڕێگای ئازادی چونکە لە بنەرەتەوە دواکەوتوو و نیەیەدارن، زوو پارچە پارچە دەبن. بەشێکیان لەگەڵ ڕێکخراوە سۆسیال شۆفینییەکەی وەک پارتی کۆمونیستی تورکیا (TKP) و پارتی کارگەری کۆمونیستی تورکیا (TIKP) دەکەون.... پ.ک.ک هەڵوەشاندن و بڵاوپێکردنی ئەو بۆرژوا بچووک و فیوداڵە کومپرادۆرە ساختەکارانەی کە نەتەوەی ئێمەیان دابەشکردووە و وەک مۆرەی شەترەنج خستوویانەتە دەست دوژمن، بە ئەرک دەزانێ. ئەرکێکی تری پ.ک.ک ئەوەیە کە ناسیۆنالیست و سۆسیال شۆفینییەکان لەناو بەرێ.... پ.ک.ک لەم باوەڕەدایە کە مافی سیاسی، کولتوری، کۆمەڵایەتی و ئابووری گەلی کوردستان بە ڕێگای شەڕ دەبین دەبێ و بۆ ئەو مەبەستەش تەواوی ئایدیۆلۆژی و تاکتیکەکانی خەباتی خۆی سەرفی ئەو ڕێگەیە دەکات... کورد لە جیاتی ئەوەی بە ئاشتی کێشەکەی چارەسەر بکات و لە ژیانی ئاشتیانە بتوێتەوە، دەبێ درێژە بە شەڕ بدات(٣).

هەروەکو گوتم، ئوجەلان بەر لە دامەزراندنی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ئەنکاراوە گەڕایەوە دیاربەکر. ناوبراو دوای دامەزراندنی پارتی و گیرانی شاهین دونمەز، دیاربەکری بەجێهێشت و چوو لە ماردین و ئورفا جێگیر بوو. چونکە لەوێش تاقەتی نەهێنا، بە یارمەتی ئەنداشێکی پ.ک.ک بە ناوی ئەدهەم ئاقچام، خەڵکی سرووج ڕایکردە کوردستانی ژێردەستی سوریا و چووە ماڵی خزمەکانی ئەو ئەندامەیان لە گوندی کوبانی. لەوێوە خۆی گەیاندە دیمەشق و چووە ناوەندی بەرەی دیموکراسی ڕزگاری فەلەستین و بەهۆی ئەوانەوە خۆی گەیاندە لوبنان و سەرئەنجام لە شیو و دۆڵی (بقاع) خۆی گرتەوە.

پ.ک.ک بە کوشتن و لەنێوبردنی ئەو ڕێکخراو و دەرمبەگانە، ترس و خۆفێکی زۆری خستە ناو دڵی گوندنشینانی کوردستان و کاتێک خەڵکەکە بینییان ڕێکخراوی وەک تێکۆشین، ئازادی و ڕزگاری و دەرمبەگی وەک سلێمان و بوجاق، کە هەرکامەیان خاوەن دەسەڵات بوون لە ناوچەی خۆیاندا و جێگەی تایبەتییان هەبوو لەنێو خەڵکدا، بەڵام نەیانتوانی لەبەرامبەر پ.ک.ک دا ڕاوەستن و تاقەت بێنن، لە هەموو جێیەک بۆ پاراستنی گیانیان پالیان بە پ.ک.ک وە دا.

کۆبوونەوەی ئەو خەڵکە لە پ.ک.ک دا، هەرچەندە مەزنایەتی خۆی هەبوو بۆ ئەو

---

٣- بلاوکراوەی کۆنگرەی دامەزرێنەری پارتی کرێکارانی کوردستان، لاپەرەکانی ٤٦ و ٥٣، سالی ٧٨، بە زمانی تورکی.

ڕێکخراوە، بەڵام قەیرانێکی گەورەشی بۆ پێکهێنا و ئەوی لە تەنگژەی ڕێکخستن و بارمێنانی هاویشت. بە گوتنی هەڤاڵ جومعە گەل شەڕی ویستووە، بەڵام پ.ک.ک نەیتوانی ڕێکیان بخات و بیانخاتە ناو شەڕ و شەڕیش بەڕێوە بەرێ و ئەوەی لە توانادا نەبوو(٤). هۆی ئەم کارەش ئەوە بوو، کە پ.ک.ک ئەوکاتە دژی دەوڵەتی تورکیا شەڕی نەدەکرد.

دوای دەرچوونی ئۆجەلان کێشەی نێوان ئەندامان چوارچێوەیەکی بەرینتری بەخۆیەوە گرت و لە ئەنجامدا ئۆجەلان چەند ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی وەلا نا و ژمارەیەکی نوێی خستە جێیان، بەڵام لەنێوان ئەوانیشدا ئالوگۆڕی پێکهێنا و محەمەد شەنەر و هەڤالانی کە فراکسیۆنێکی دژ بوون، تاوانبار کرد و ڕایانگەیاند کە ئەوانە لەگەڵ دوژمنن. ئۆجەلان بۆ ئەوەی کۆتایی بەو کێشەیە بێنێ، بەر لە کودیتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ بڕیاریدا، فاتمەی خێزانی و باقی (سلێمان) برای حەقی قەرار لەگەڵ دوو گروپ بنێرنە سوریا. دوای دەرچوونی ئەو ژمارەیە، پ.ک.ک کەوتنە بەر پەلاماری ڕژێم و نزیکەی ٧٠٪ی کادیرەکانی گیران، بەڵام لە کودیتای ١٩٨٠دا، زیان بە ئەندامانی نەگەیشت و دوای ئەویش نزیکەی ٣٠٠ کەسیان ناردە سوریا. ئەو ژمارەیە لە سور، سەیدا، نەبەتیە، داموڕا، حاسیبە و بەیروت جێگیر کران.

لەنێوان کادیر و ئەندامانی پ.ک.ک دا لە زیندانی دیاربەکر، کەمال پیر، مەزلوم دۆغان و محەمەد خەیری دوورموش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوون. مەزلووم ڕۆژی ٢١ی ئاداری ١٩٨٢ بە مەبەستی پیرۆز کردنی جەژنی نەورۆز لە زینداندا خۆی سوتاند و بووە مەشخەڵی ئاگری سەر لە بەیانی نەورۆز و دروشمی (بەرخۆدان ژیانە)ی بەرز کردەوە و خەیانەت و تەسلیم بوونی بە تورک مەحکوم کرد. دوای ئەو، لە ١٩٨٢/٥/١٨، فەرهاد، ئەشرەف، ئەجمی و مەحمود ڕێگەی مەزلومیان گرتە بەر و ئاگریان لە جەستەی خۆیان بەردا. ئۆجەلان لە بەرامبەر فیداکاریی ئەوانەدا و لە وەلامی ئەو پرسیارەیدا کە:

- «هەڵویستی خەباتگێڕ دەبێ چ بێت لە بەرامبەر لە سێدارەدانەکان و قەسابخانەکان کە دوژمن ئەنجامیان دەدەن و لە بەرامبەر ڕووداوەکانی شەهید بوون لە کاتی کردارە جەنگییەکان و لە ناوەوەی زیندانەکان و ڕووداوەکانی مەرگی ئاساییدا؟» دەڵێ:

---

٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٣١٦

.... دوژمن له ژێر زەبری ئەشکەنجەدا پەیمانی بە شۆڕشگێڕاندا کە لە ژیان بمێننەوە بەو مەرجەی واز لە ئامانجەکانیان بهێنن، واز لە پارتی بهێنن! واز لە ڕزگاربوونی نیشتمانی و نەتەوەیەتی بهێنن کە پارتی لە پێناویاندا تێدەکۆشێت! ئەگەر وەهاش بکەن ڕێگای ژیان لەبەر دەمتاندا کراوە دەبێت. دوژمن هەوڵیدا بەم ڕێگایە خۆبەدەستەوەدان بەسەر شۆڕشگێڕاندا بسەپێنێت. زۆر سۆز و پەیمانی هەڵخەڵەتێنەرانەی تریشی پێدان. شتێکی ڕوونە وردە بۆرژوا هیچ و پوچەکان کە ناپاکییان لە دۆزەکە کرد و سازشکارییان لەگەڵ دوژمن ئەنجامدا لەبەرامبەر کەوچکە نیسکێنەیەک، بەبێ ئەشکەنجە و ئازار هەل و دەرفەتی ژیانیان بەدەست هێنا. هەرچی شۆڕشگێڕەکانیش کە وازیان لەو بەهایانە نەهێنا کە لە پێناویدا تێدەکۆشان ئەوا لەبەرامبەردا شێوە مردنەکان بووە بەشیان کە دنیا وێنەی وەهای بەخۆوە نەدی بوو و ناچار کران بە ژیانێکی پڕ لە ئەشکەنجە و ئازار و لە قەسابخانەی دڕندە و خراپەکان بژین. دوژمن ناپاکێتی و نۆکەری کردە ڕێگای ژیان. هەڤالانی ئێمە مردن و شەهید بوونیان هەڵبژارد و دروشمی «بەرخۆدان ژیانە»یان بەرز کردەوە. هەڤالانمان مردنی بێ تایبەتمەندییەکانیان هەڵنەبژارد، بەڵکو مردنی پشتبەستوو بە بەرەنگاربوونەوەیان هەڵبژارد و ئەم مردن و شەهید بوونەیان ناو نا ژیان. فەرمووبیان مردن و شەهید بوون لەسەر ڕێگای بەرەنگار بوونەوە ژیان خۆیەتی، ئەوەش ناوی ژیانی ڕاستەقینەیە(٥).

دوای کشانەوەی هێزەکانی پ.ک.ک لە کوردستانی ژێردەستی تورکیا، ئۆجەلان لە فکری تەسفیە و پاککردنەوەی حیزب لە ئەندامە نارازی و ڕەخنەگرەکان کەوت. بۆ ئەو مەبەستە کۆنفرانسێکی پێکهێنا. کۆنفرانس کۆمیتە ناوەندییەکی نوێی هەڵبژارد و بڕیاری دا فاتمە، سەمیر، سلێمان، عەلی حەیدەر قەیتان (فواد) و چەند کەسێکی تر بنێرێتە ئەوروپا، تا لەوێ ڕۆژنامەی سەرخۆبوون چاپ و بلاوبکەنەوە. کۆنگرە، «داود»ی بە تاوانی کوشتنی چەند هەڤالی کە تاوانی سیخوڕییان لەسەر بوو، گوللەباران کرد و بە گوتنی هەڤال جومعە بەمجۆرە کێشەکان چارەسەر کران. دوای کۆنفرانس پلانی ڕفاندنی فڕۆکەیەکی تورک و بە بارمتەگرتنی چەند کەسێک دادەڕێژن و گروپێکیش بۆ ئەو مەبەستە دیاری دەکەن، بەڵام چونکە ئەندامان چاوترسێن ببوون، ئامادە نەبوون بگەڕێنەوە تورکیا(٦).

کۆنفرانس نەیتوانی کێشەکان بنبڕ بکات و دوای کۆنفرانس بە شێوەیەکی تر سەریان بەرز کردوە، لەبەرئەوە ئۆجەلان بە مەبەستی پاککردنەوە و تەسفیەی

---

٥- پرسی کەسایەتی لە کوردستاندا لاپەڕەی ٣٩١.

٦- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ٣٦٧

ئەوانی رەخنەگران، برهاری پێکهاتنی کۆنگرەیدا. لە کۆنگرەدا ژمارەیەکی تریان لە بەرپرسایەتی خست و سەمیر و ساغر (جومعەی کەر)یان وەلا نا. کۆنگرە، بۆ ئەوەی دەستەلاتێکی پتر بە ئۆجەلان بدرێ، بە تیروتەسەلی ئامارەی بە رۆڵی سەرۆکایەتی لە شۆرشدا کرد و ئەو رایەی خستە روو کە مەحاڵ جومعە پەنجەی بۆ رادەکێشن و دەڵێن:

- **ئێوە هیچ کەس و هیچ سنورێک نەناسێ و تەنیا خۆی پیادە دەکات. کەلێک کەس و تەنانەت دەوڵەتیش ئەو رەخنەیە دەکەن. پێش هەموو شتێک پێویستە بڵێین ئەمە راستە، سەرۆک ئێوە خۆی پیادە دەکات و دەبێ خۆشی پیادە بکات، چونکە ئێوە سەرۆکایەتییە. لە مێژووی مرۆڤایەتیدا سەرۆکایەتی هەردەم ئەوا هەڵس و کەوتیان کردووە(٧).**

کۆنگرە کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژارد، بەلام دەستەلاتی مانەوەی ئەندامانی لەو کۆمیتەیەدا دایە دەست ئۆجەلان و رایگەیاند، ئەگەر سەرۆکایەتی رازی بێ کۆمیتە وەک خۆی دەمێنێتەوە، ئەگینا ئۆجەلان کەسانی تریان لە جێ دادەنێ، کە ئەوەش دیاردەیەک بەستراوەتەوە بە ستروکتوری پ.ک.ک وە، کە سەرۆک بۆ خۆی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیاری دەکات و ئالوگۆریان لەناودا پێکدێنێ. کۆنگرە هەروەها هاوکاریی تاکتیکی خۆی لەگەڵ سوریا، لیبیا و ئێران خستە بەرباس و بریاریدا، ئەو پەیمانە تاکتیکییە بەرەوپێش بچێ و گرنگی پێ بدرێ کە خۆ بگەیەنە پەیوەندییەکی ستراتیژی و پارتی دەبێ بە ئارامی بەلام بەرین و شێلگیرانە خەباتی بۆ بکات(٨)

هەرلەو ساڵەدا (١٩٨٢)، ئیسرائیل هێرشی کردە سەر لوبنان و بەیروتی گەمارۆ دا و دە ئەندامی پ.ک.ک ی شەهید کرد و دە کەسیشی لێ بەدیل گرتن. ئیسرائیل دیلەکانی لەگەڵ فەلەستینییەکان گۆڕییەوە. شەڕ و ئاژاوە لە لوبناندا، بە ئۆجەلانی سەلماند کە جێگەیەکی تر بۆ حەوانەوەی هێزەکانی بدۆزێتەوە، تا ئەگەر لوبنانیان لەدەست چوو، هێزەکانی زەبریان لێ نەکەوێ. ئۆجەلان بەم مەبەستە دوو نوێنەری خۆی بە ناوی محەمەد قەرەسونگور و عەگید لە سوریاوە بە فرۆکە ناردە ئێران، تا لەگەڵ کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی بدوێن و پەیوەندیی بە رێکخراوە سیاسییە کوردییەکانیشەوە بکەن.

---

٧- هەمان سەرچاوە لاپەرەی ٤١٦

٨- بەیانی کۆنگرەی دووهەم، سەرخۆبوون، ژمارەی ٦٠، مانگی ١٢، ساڵی ١٩٨٦، لاپەرەی ٢٨، بە زمانی تورکی.

سـالی ١٩٨٣، ئوجـەلان دوای ڕێککەوتن لەگـەڵ ئێـران و پارتی دیموکـراتی کوردستان، بڕیاری دا بەرەبەرە ئەندامانی پ.ک.ک بنێرێتە باشووری کوردستان و دوای خۆ ڕێکخستنیان لەوێ، لە ناوچەی حەکاری شەڕی چەکدارانە بەڕێوەبەرن. ئوجەلان بۆ ئەوکارە، پرۆتۆکۆلێکی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان مۆر کرد و بە یارمەتی پارتی بەشێک لە هێزەکانی لە لۆلان، حەفتانین، مێروس و خواکورک جێگیر کرد. ئوجەلان بەرپرسایەتی ئەو بزافەی بە دوران کالکان (عەباس) جێگری ئەوکاتەی خۆی سپارد و دوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بە ناوی سەلیم چرووکەیا و سلێمان و جێگرێکی کۆمیتەی ناوەندیی بەناوی تەرزی جەمال لەگەڵ ئەو ناردە باشـووری کـوردسـتـان. ئوجـەلان کـاتی بەڕێکردنی ئەندامـانی بۆ باشـووری کوردستان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی پەیمانە مۆر کراوەکەی لەگەڵ پارتی دیموکرات، بە ئەندامەکانی ڕاگەیاند:

**ڕێککەوتنی ئێمە لەگـەڵ پارتی دیموکـرات، دیاردەیەکی تاکتیکییە. ئەگینا پارتی دیموکـرات ڕێکخـراوێکی بە ئەزمـوون، تەڵەکـەباز و پیـلانگێـرە و نابێ بکەونە ژێر تانسیری(٩).**

هێزەکانی پ.ک.ک بەمجۆرە لە سالی ١٩٨٣وە لە باشووری کوردستان جێگیر بوون و سەرەتا دووران کالکان (عەباس) لە «زاپ» بارەگای کردەوە و سەلیمیش لە «حەفتانین» و بەرەبەرە هاتووچۆی ناوچەی بۆتانیان کرد، بەڵام هەتا ١٩٨٤/٨/١٥ دەستیان لە چەکدارەکانی ڕژێمی تورکیا نەوەشاند. پ.ک.ک بۆ یەکەم جار لە ١٩٨٤/٨/١٥دا ویستی لە سێ قەزای شەمدینان، ئەروح و چەتاخ دەست لە دوژمن بوەشێنێ. لە قەزاکانی شەمدینان و ئەروح دەستی وەشاند، بەڵام هەڤاڵ جومعە ئامازەی بە ناکامەکەی نەکردووە. ١٥ی ئاب بۆ پ.ک.ک ڕۆژێکی گرنگی مێژوویییە، چونکە دوای تێپەڕبوونی دوانزدە ساڵ خەبات، بۆ یەکەم جار لەو ڕۆژەدا یەکەم فیشەکی بەرەو دوژمن تەقاند.

پ.ک.ک بەپێی بڕیاری کۆنگرەی دووەم، لە ساڵی ١٩٨٤وە پەیوەندییەکانی بە ڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە بەهێز کرد و لە کۆنگرەی سێیەمیدا، ئەو پەیوەندییەی بە ستراتیژی خۆی ناساند. لەبەرئەوە، جێگەی خۆیەتی بزانین ئوجەلان لە ڕاگەیاندنێکیدا کە بە زمانی عەرەبی لەژێر ناوی (ڕوونکردنەوەیەک لەسەر کتێبی سەرکردە و گەل، حەوت ڕۆژ لەگەڵ ئاپۆ دا) بڵاوی کردووەتەوە، چۆن

٩- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ٤٥١

سەبارەت بە سووریا و ئێران دەدوێ. ئۆجەلان دەڵێ:

بڕیارەی ئامانجە ستراتیژییە گشتییەکانی پ.ک.ک و ستراتیژی پ.ک.ک

. ئەو کوردانەی کە لە مافی ئینتەرنەیشنالیزم و سیاسەت ناگەن، کەم و بێ مێشک و کوێرن. ئەگەر بۆ دوژمن لەسەر ئەم ئامانجە ستراتیژییەکان تەمثولت کرد، ئەوە شێت و گەمژەن..... ئەو چوار دەوڵەتەی کوردستانیان داگیر کردووە، هەموویان دوژمنمان نین. بۆیە نابێ بە چاوێک سەیری هەموویان بکەین.... بەهۆی سیاسەتی ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، عەرەب و ئێران لە تورکیا فاشی دوورکەوتنەوە و ئەویش سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ ستراتیژی ئێمە... کاتێک پ.ک.ک زەختی زۆری خستە سەر تورکیا، تورکیا ناچار بوو داوای یارمەتی لە ئیسرائیل بکات و هەر کە ئێران بیستی تورکیا لەگەڵ ئیسرائیل پێکهاتووە و ڕێککەوتنەکەشیان مەترسییەکی گەورەی بۆ سەر ئەو هەیە، وای لێهات سەرنج بداتە ستراتیژی پ.ک.ک، چونکە بۆچوونی لە پ.ک.ک نزیکە. ستراتیژی پ.ک.ک وای لێکرد لە کورد نزیک بێتەوە، ئەوەش گۆڕانێکی مێژووییە لە ستراتیژی ئێراندا لەسەر کێشەی نەتەوەی کورد(۱۰).

ئۆجەلان لەبەر تیشکی ئەو ستراتیژییەی کە پ.ک.ک لەگەڵ ئێران هەیەتی، لە کۆڕێکی MEDtvدا کە ڕۆژی دووی ڕێبەندانی ۱۹۹٦، بە یادی «پەنجاهەمین ساڵڕۆژی دامەزرانی کۆماری کوردستان لە مهاباد» ئامادە کرابوو، بە تەلەفۆن ڕایگەیاند: بە تەجرەبەی ئێمە کۆماری ئیسلامی ئێران وەک ڕژێمی شای ئێران نیە و مرۆڤ باش هەست بەو جیاوازییە دەکات... پارتی دیموکرات ماوەیەکی درێژ دژی شای ئێران شەڕی کرد. شەهیدی دا، گەلێک لە ئەندامەکانی زیندانی کران. ئەوان شەهیدی دیموکراسی و تەنانەت شەهیدی وڵات پارێزیی ئێرانن. ئەگەر ئێوە دژی ئیمپریالیست بن، ئێمە ئامادەین لە کۆماری ئیسلامی داوا بکەین دۆستایەتی لەگەڵ کوردان بکات. ئێمە بەناوی پارتی کرێکارانی کوردستان بە پێویستی دەزانین دۆستایەتی کوردی ڕۆژهەڵات بکەین، ئەوە بۆ کۆماری ئیسلامی سەرکەوتنە و بۆ کوردانیش هەنگاوێکی گرنگە. گەلی کورد، میللەتی کورد میللەتێکی ئێرانییە. لە زمان و کولتووردا برای یەکدی بوون. ئێمە ئامانەوێ کورد بە دژی کۆماری ئیسلامی ڕاوەستێ، هەروەکاتەشدا لە کۆماری ئیسلامیمان دەوێ لەسەر هەموو کوردەکان نەک هەر کوردی ڕۆژهەڵات، بەڵکو بۆ هەموو کوردان سیاسەت داڕێژێ. ئێمە هەردوو موحتاجی یەکترین.

---

۱۰- ڕوونکردنەوەیەکی ئۆجەلان بە زمانی عەرەبی، لەسەر کتێبی سەرکردە و گەل حەوت ڕۆژ لەگەڵ ئاپۆ دا.

پ.ک.ک لە درێژەی ئەو سیاسەتەیدا لە ساڵی ١٩٩٦ەوە هەتا ئێستا گەلێک خزمەتی گرنگی بە دەوڵەتی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامی کردووە. ڕۆژی ١٩٩٨/٦/١ گەریلاکانی پ.ک.ک گرووپێکی نۆ کەسی پێشمەرگەی «یەکێتیی شۆڕشگێرانی گەلی کوردستان»ی، کە خەریکی حەسانەوە بوون، بەلاماردا و هەموویان شەهید کرد. پ.ک.ک تەرمی کوژراوەکانی هەڵگرت و بە دیاریی تەسلیمی کاربەدەستانی وەزارەتی ئیتلاعاتی ئێرانی کرد و ئەوانیش تەرمی پێشمەرگە شەهیدەکانیان لە شاری پیرانشار نمایش دا(١١). پ.ک.ک ئەمڕۆ لە ناوچەکانی شنۆ، پیرانشار و سەردەشت، سنووری دەستکردی ئێران دەپارێزێ و لەجیاتی پاسدارە کۆنەپەرستەکان براکوردەکانی دەپشکنێ و لە نێوان ڕۆژهەلات و باشووری کوردستاندا، گومرگ لە دانیشتوان دەستێنێ.

ئۆجەلان سەبارەت بە کوردەکانی سوریاش بە نبیل ملحم نوسەری کتێبی سەرکردە و گەل، حەوت ڕۆژ لەگەڵ ئاپۆدا دەڵێ:

- زۆربەی کوردەکانی نیشتەجێی سوریا لە باکوورەوە هاتوون و ئەگەر ئەسڵی هەر خێزانێک بگەڕێنینەوە بۆ ٥٠-١٠٠ ساڵ لەمەوپێش، دەبینین هەموویان لە باکوور و چیاکانی زاگرۆس، تۆرۆس و بۆتانەوە هاتوون و ئەوەش دیاردەیەکی مێژووییە و کەس ناتوانێ نکوڵی لێ بکات.

ناوبراو بەو پێیە ئەرک دەخاتە سەرشانی پ.ک.ک، کە ناوی کوردستانی سوریا بسڕێتەوە و بۆ ئەو مەبەستەش کوردی سوریای لە ڕیزی پ.ک.کدا کۆکردووەتەوە، کە بە بیانووی خەباتی کوردایەتی لە وڵاتی خۆیان دووریان بکاتەوە. ناوبراو سەبارەت بەو مەسەلەیە، لە لاپەڕەی ١٦٨ی «حەوت ڕۆژ لەگەڵ ئاپۆ ڕێبەر و گەل» دا دەڵێ:

**- بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم کە ئەوان (مەبەست کوردی ژێردەستی سوریا، لە باکووری کوردستانەوە هاتوون. لە سەرەتای هاتنم بۆ کۆڕەپانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ڕامگەیاند کە پێویستە هێرش بۆ مەلبەندی باشوور ڕابگیرێ و هێرش بەرەو باکوور بێ.** نبیل ملحم دەپرسێ: مەبەست لە هێرش بۆ باشوور چییە؟

**- گوتم کۆچکردن بەرەو باشوور ڕابگیرێ و کۆچکردن بەرەو باکوور بێ. هێرشێکی بەربڵاو و خەباتێکی توندوتیژمان دەست پێکرد و کوردەکانی سوریامان بەرەو چیاکان و بەرەو باکوور کشاندەوە. وا بزانم سوریا لەم سیاسەتەمان ڕازی بێ و ئێمەش ڕازین.**

---

١١- بەیاننامەی ڕۆژی ١٩٩٨/٦/٣ی کۆمیتەی ناوەندی یەکێتیی شۆڕشگێرانی گەلی کوردستان.

لەکاتێکدا ئۆجەلان باسی مێژووی ٥٠- ١٠٠ ساڵی کورد دەکات لە سوریادا. کە هیچ کەسێک لە دنیادا ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە سەلاحەدینی ئەیوبی پتر ٩٠٠ ساڵ میری شام بووە و هێرشە یەک لە دوای یەکەکانی سەلیبییەکانی وەستاندووە، مەگەر کەم کەس هەبێت نکوڵی لەوە بکات کە سەلاحەدین کورد بووە و دانیشتووی ئەو بەشەی کوردستان بووە. یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٢دا، ژمارە بەڵگەنامەیەکی دەربارەی پەیوەندییەکانی پ.ک.ک و رژێمی عێراق بلاوکردەوە. بەڵگەنامەکان باس لەوە دەکەن کە پ.ک.ک لە ساڵی ١٩٩٠وە پەیوەندی لەگەڵ دەزگای پاراستنی عێراق (مخابرات و ئیستخبارات) دامەزراندووە و ئامانجی لەوەش زەبر وەشاندن لە بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کوردستان و ئاشکراکردنی جموجوڵی دەوڵەتەکانی ئێران، تورکیا و ئەمریکا لە هەرێمەکەدا بووە. سەرۆکایەتی ئەمنی گشتی عێراق لە نامەی ژمارە (ش.س.ش.٢- ٢٧٩٢٥- ١٩٩٠/٩/١٠)یدا ئاماژە بە دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ پ.ک.ک دەکات و لە بەشێکیدا دەنوسێ:

**« بۆ پوچەڵکردنەوەی پیلانی تێکدەران دژی عێراق، کە لە لایەن ئێران، ئەمریکا و تورکیاوە هاندەدرێن، پێویستە بە شێوەیەکی زۆر نهێنی، کە تورکیا نەهەروژێنێ، پەیوەندی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان تورکیا بگیرێ(١٢)».**

دوای ١٥ی ئابی ١٩٨٤، کێشەی ناوخۆی پ.ک.ک بۆ بەدەست گرتنی دەسەلات بەوپەڕی دەگات. چەتین گونگور (سەمیر)، کەسیرە (فاتمە)، دوران کالکان (عەباس)، عەلی حەیدەر قەیتان (فواد) و باقی قەرار (سلێمان) هەرکام بە شێوەیەک دژی دەسەلاتدارییەتی ئۆجەلان راوەستاون. لەبەر ئەوە، ئۆجەلان بڕیار دەدات فاتمە و سەلیم لە ئەورووپاوە بگەڕێنەوە ناوەندی سەرۆکایەتی. فاتمە هەر کە گەڕایەوە، راپۆرتێکیان لەسەر خۆی پێ نوسی و بڕیاری ئیعدامیان دا، بەلام ئۆجەلان قەبوڵی نەکرد. کێشەی ناوخۆی پ.ک.ک لەو ساڵەدا گەیشتە جێیەک، کە چەند کەسێک، لەوانە فەرهادی برای ئۆجەلان، بڕیاریان دا خۆیان بکوژن. هەڤاڵ جومعە لە لاپەڕەی ٤٩١ی کتێبەکەیدا ئاماژە بە نامەیەک دەکات کە فەرهاد ئۆجەلان بۆ عەبدوللا ئۆجەلانی نوسیوە:

**« ئەگەر بە کوشتنی من پارتی رزگاری دەبێت، ئەوا من ئامادەم خۆم بکوژم».**

**ئۆجەلان لە وەلامی ئەودا، نامەیەکی بۆ فێرکە نوسیوە و لەوێدا بەتوندی رەخنەی لە**

---

١٢- بەڵگەنامەی ژمارە (ش.س.ش.٢- ٢٧٩٢٥- ١٩٩٠/٩/١٠) ئیدارەی ئەمنی عێراق.

**فەرهاد گرتووە و داوای لێ کردووە هەلومەرجی خۆی لەبەرچاو بگرێ. لە ئەنجامدا فەرهاد وازی لە کوشتنی خۆی هێناوە.**

پ.ک.ک بۆ ئەوەی کە لەو تەنگژەیە رزگاری بێ و کۆتایی بە کێشە ناوخۆییەکانی بێنێ، دەست دەکات بە تیرۆری کادیرە ناڕازییەکانی. ڕۆژی ١٩٨٤/٦/٢٠ لە شاری ئۆپسالای سوید، ئەنودر عەتا دەکوژێ. دوابەدوای ئەو، دەیەوێ لە دوورتمونددی ئالمان کۆتایی بە ژیانی سەلاحەدین چەلیک (سەلیم خوجە) بێنێ. بەلام تەنیا برینداری دەکات و نامرێ. ڕۆژی ١٩٨٥/١١/٢ لە کاتی یادکردنەوەی دە ساڵەی پارتی پێشەنگی کارگەرانی کوردستان (PPKK)، لە هۆڵی مێدبەرگار هوسێت (Medborgarhuset)ی ستۆکهۆڵم لەبەرچاوی بەشداران پەلاماری چەتین گونگور (سەمیر) دەدات. هەڤاڵ جومعە دەربارەی کوشتنی سەمیر دەڵێ:

**سەمیر کەلێک هەڤاڵی بەنرخ و گرێدراوی پارتی کەنارگیر کردبوو و هەموو ڕۆڵێکی لێ وەرگرتبوون و زۆربەی هەڤاڵانی ئەوروپا کەوتبوونە ژێر کارگەریی سەمیر. لەوەش زیاتر شان بە شانی ئەو لە دژی پارتی شەڕیان دەکرد لە بەرامبەر ڕێکخستن و ڕەسمییەتی پارتی هەڵوێستی نادروستیان وەرگرتبوو، بۆیە فەرمانەکانی سەرۆکایەتیان پێک نەدەهێنا و میللەت ئەرکی ئەوانی بەجێ گەیاند. گەلی کوردی وڵاتپارێزی ئەوروپا لە دژی سەمیر و داروودەستەکەی هەڵسا و بە جارێک ڕاپەڕین و لە ماوەی دوو ڕۆژ مەسەلەی سەمیریان بەو ڕەنگە چارەسەر کرد(١٣).**

پ.ک.ک دوای تیرۆری ئەو کادیرانەی و چەندیر کادیری تری، بڕیاری پێکهاتنی کۆنگرەی سێیەمی داوە و لە ڕۆژانی ٢٥-١٩٨٦/١٠/٣٠دا، کۆنگرەی سێیەمی پێکهێناوە. بە وتەی هەڤاڵ جومعە، لە کۆنگرەدا ئەو چەمکانەی خوارەوە لەبەرامبەر یەکتردا سەنگەریان گرتووە و چەمکی ئۆجەلان بەسەر ئەواندا زاڵ بووە:

- چەمکی سۆسیالیزم کە ئۆجەلان نوێنەرایەتی دەکرد.
- چەمکی بۆرژوازی بچوک کە کەمالیست و ڕۆشنبیرەکان جێیان تێداگرتبوو و هەڤاڵ عەباس نوێنەرایەتی دەکرد.
- چەمکی فیودالیزم- ئاریستۆکرات کە بەکرێگیراوەکان (سەمیر و فاتمە) نوێنەری بوون.
- چەمکی چوارەم، چەمکی نیوەشۆڕشگێر بوو. ئەوەی هێڵی ناوەند بوو لەو چەمکەدا کۆ ببوونەوە.

---

١٣- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٤٣٦

له ئه‌نجامدا سه‌رۆكایه‌تی (سۆسیالیزم) له‌ پارتیدا حاكم بوو و جه‌مكه‌كانی تر مه‌حكووم كران(١٤).

كۆنگره‌ كارمكانی به‌مجۆره‌ دابه‌ش كرد: ئه‌ركی ولاتی به‌ كۆرجه‌مال. شێخ مووس و فه‌رهاد سپارد. فه‌رهاد بووه‌ به‌رپرسی په‌یوه‌ندی پ.ک.ک له‌گه‌ل كۆماری ئیسلامی ئێران. سه‌لیم و فاتمه‌یان له‌ پ.ک.ک ده‌ركرد و دایانن به‌ ئه‌رنه‌كه‌. فاتمه‌یان نارده‌ یۆنان و سه‌لیم بۆ ئه‌وروپا. عه‌باس و عه‌لی چه‌تینه‌ر (جه‌عفه‌ر)یان كرده‌ به‌رپرسی ئه‌وروپا، به‌لام جه‌عفه‌ر رایكرده‌ توركیا و دوای ماوه‌یه‌ک گه‌رایه‌وه‌ لای پ.ک.ک و له‌وێوه‌ چووه‌ ئالمان. هه‌روه‌ها جه‌مال له‌ ناوه‌ندی سه‌رۆكایه‌تی له‌ لوبنان راگیرا(١٥).

كۆنگره‌ له‌سه‌ر پێشنیاری ئۆجه‌لان ناوی HRKی كردووه‌ به‌ ERNK و هه‌روه‌ها بریاریداوه‌ هێزه‌كانی تاكتیكی شه‌ری گریلا پیاده‌ بكه‌ن و سوپای گریلا پێک بێنن. بۆ پێكهێنانی سوپای گریلاش، یاسای سه‌ربازگیریی زۆره‌ملێیان به‌ بنچینه‌ گرت و ئه‌و یاسایه‌یان كرد به‌ یاسای بنه‌ره‌تی و گشتی له‌ كوردستاندا(١٦).

دوای كۆنگره‌، كۆرجه‌مال به‌ مه‌به‌ستی به‌جێگه‌یاندنی بریاری كۆنگره‌، ژماره‌یه‌كی نارده‌ شه‌مدینان تا یاسای سه‌ربازگیری زۆره‌ملێ پیاده‌ بكه‌ن. ناوبراو به‌ گروپه‌كه‌ی ده‌لێ «بچن یاسای سه‌ربازی زۆره‌ملێ پیاده‌ بكه‌ن و هه‌ر كورێكی وه‌به‌ر ده‌ستیان هات له‌ناو گونده‌كاندا بیگرن و بیهێنن و بۆ چاوترساندنی گوندییه‌كانیش یه‌كێكیش بكوژن.» گریلاكانیش به‌ گوێره‌ی ئه‌و فه‌رمانه‌، هه‌فال جومعه‌ گوته‌نی وه‌ک گورگ كه‌ ده‌كه‌وێته‌ ناو مه‌ر، ده‌كه‌ونه‌ ناو خه‌لک و هه‌ركه‌سیان به‌رده‌ست ده‌كه‌وێ، ده‌یگرن و ژماره‌یه‌كی بێ تاوانیش ده‌كوژن(١٧). پ.ک.ک له‌ درێژه‌ی ئه‌و سیاسه‌ته‌یدا له‌ ناوچه‌ی شه‌مدینان ژماره‌یه‌كی كوشت. كۆمه‌لێكیش ناچار بوون بۆ ئه‌وه‌ی ناوی سیخور و جاشێتییان نه‌كه‌وێته‌ سه‌ر، پال به‌ پ.ک.ک وه‌ بده‌ن و ئه‌وانی تریش په‌نایان بۆ دوژمن برد.

ماوه‌یه‌كی كورت دوای كۆنگره‌، عه‌بدوللا ئۆجه‌لان ره‌خنه‌ی له‌ خه‌باتی كۆمیته‌ی به‌ناو ناوه‌ندی هه‌لبژێراوی كۆنگره‌ له‌ باشووری كوردستان گرت و كۆمیته‌كه‌ی هه‌لوه‌شاند و كۆمیته‌یه‌كی پێنج كه‌سیی له‌ ئه‌ندامانی تر، له‌جێی دانا. دوای ئه‌و

---

١٤- هه‌مان سه‌رچاوه‌ لاپه‌ره‌ی ٤٩٥
١٥- هه‌مان سه‌رچاوه‌ لاپه‌ره‌ی ٤٩٧
١٦- هه‌مان سه‌رچاوه‌ لاپه‌ره‌ی ٤٩.٧
١٧- هه‌مان سه‌رچاوه‌ لاپه‌ره‌ی ٥١١

کورانکارییە، شێخ مووس کچێکی بە ناوی زینەب هەڵگرت و لەگەڵ ئەو رایکردە ئێران و خۆی تەسلیمی ئێرانییەکان کرد.

پ.ک.ک لەو ساڵەدا (١٩٨٦) چەند چالاکی بچووکی چەکداری بەرێوە بردووە. کەسێکیان بە ناوی وەهاب بەشێوەی گیانبازی (ئینتحار) چووەتە سەر دوژمن و شەهید بووە. کەسێکی تریشیان بە ناوی ئەردال لە شەڕدا کوژرا، بەڵام بۆیان روون نەبووە کێ کوشتی، بە چەکی خۆیان کوژرا یان بە چەکی دوژمن(١٨).

دوای ئەو رووداوانە، ئۆجەلان کۆنفرانسێکی بۆ هێزەکانی لە باشووری کوردستان پێکهێنا. بەم مەبەستە دوو گرووپی لە سووریاوە رەوانەی باشووری کوردستان کرد. یەک لەوانە بە سەرۆکایەتی خەلیل ئاتاج (ئەبوبەکر) بە فڕۆکە چووە تاران و ئەویتریان، کە گرووپێکی تایبەتی بوو و بە وتەی جومعە گەلێک رێنوێنی و فەرمانی ئۆجەلانی پێ بوو، بە چیای جودیدا رەوانە کرا، کە لە بناری چیای جودی کەوتە بۆسەی دوژمن و هەموویان کوژران(١٩).

دوابەدوای ئەو رووداوانە، دلاوەر یلدرم کە ئەندامێکی شارەزا و لێزان بووە لە پ.ک.ک دا، بەهۆی گوشاری ئۆجەلان و لایەنگرانی. کاتی کێشک بوونی لە غیرگە خۆی کوشت. ساڵی ١٩٨٨، پارێزەر حوسێن یلدرم کە پێشتر لە رێکخراوی کاوەدا خەباتی کردبوو و پاشان هاتبووە نێو پ.ک.ک، لە ئەوروپا هەوڵی دیموکراتیزە کردنی پ.ک.ک ی دەدا، کە ئەویشیان لە هۆلەندا تیرۆر کرد. بەڵام برینەکانی تیمار کران. هەڤاڵ جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**ئاوبراو بە پیلانی فاتمە و سەمیر دەیانەویست سەرۆکایەتی بکێشنە ئەوروپا، بۆ ئەوەی بیگرن و بڵێن تیرۆریستە! و بەم شێوەیە پارتی بخەنە دەستی خۆیان و بێگومان سەرۆکایەتیش نەچوو و نەشچێت(٢٠).** حوسێن یلدرم سەرئەنجام لە پ.ک.ک جیا دەبێتەوە و زۆربەی ئەندامانی پ.ک.ک لە ئەوروپا لەگەڵ خۆی دەبات، بەڵام بە فەرمانی ئۆجەلان تیرۆری دەکەن.

کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ و سەرەتای ١٩٨٩، ئۆجەلان چەند گرووپێکی نارده باشووری کوردستان. دوو کەس بە ناوی مەتین و هۆگر، بەرپرسی ئەو گرووپانە بوون. ئەوانە بەشێوەی کۆرجەمال رەگاژۆییان کردە باکووری کوردستان و ژمارەیەکی زۆریان لە خەڵکی گوندەکانی کوردستان کوشت و ژمارەیەکیشیان ناچار کرد پاڵ بە

---

١٨- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥١٩

١٩- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٢٢

٢٠- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٣٠

دوژمنەوە بدەن. هۆکر و گروپەکەی هەروەها سەرۆک عەشیرەتی ئالانیان بە ناوی سەعدون ئاغا و چەند کەسی تری ئەو عەشیرەتەیان کوشت و لە ئەنجامدا ئەندامانی ئەو عەشیرەتە و عەشیرەتەکانی دەوروبەریان ناچار کرد بۆ پارێزگاری کردن لە گیانیان چەکی دوژمن هەڵگرن. هەرلەو ساڵەدا ژمارە خوێندکارێکی زۆر لە شارەکانەوە لە دەست زوڵم و ستەمی دەوڵەتی تورکیا رایانکردە لای پ.ک.ک، بەلام پ.ک.ک هەموویانی کوشت و رایگەیاند: .ئەوانە ئاژان و سیخوڕن یاخود بە زۆر هیناویانن و بە دڵەوە نەهاتوون و زۆر زوو هەڵدێن(٢١).. کردەوەکانی گرووپی هۆگر لە لایەن چەند ئەندامێکەوە کەوتە بەرباسی کۆنفرانسی پ.ک.ک، بەلام بەشدارانی کۆنفرانس لە جیاتی رەخنە، رێزیان لێ گرت و هۆگر و گروپەکەیان خەڵات کرد. ئەوەش بووە هۆی بەردەسەندنی دیاردەی کورد کوژیی لە پ.ک.ک دا و هەموو لایەک بۆ کوشتنی خەڵک و وەرگرتنی خەڵات بەیەکەوە پێشبڕکێ یان کرد. هەڤاڵ جومعە لە لاپەڕەی ١٥٥ی کتێبەکەیدا ئاماژە بەو دیاردەیە دەکات و دەڵێ:

**ئەو پراتیکە تەنیا نەدەگەڕایەوە سەر هۆگر، چونکە پراتیکی ١٩٨٩ بەگشتی لە هەموو وڵات پراتیکی تەسفیە بوو. ئەو پراتیکە لە ناوچەی چقورجە لە لایەن ساری باران و دیش سز مەحمود پیادە کرابوو، لەگەڵ پراتیکی ناوچەی بێت الشبب و قاشوورا لە لایەن دکتۆر بارانەوە بەڕێوە چووبوو، لە ناوچەکانی تریش هۆگر هەمان پراتیکی بەڕێوە بردبوو، ئەمانە هەمووی یەکتریان تەواو کرد و ئەنجامێکی تەسفیەیان لێدەرکەوت. لە ئەنجامی پراتیکی دوکتۆر بارانیش ناوچەی قاشوورا هەمووی ببوونە جاش، چونکە بەبێ سووچ و تاوان، گەلێک کەسی کوشتبوو. لە هەمان کاتیشدا ساری باران و دیش سز مەحمود لە ناوچەی چقورجە ئەم پراتیکەیان بەڕێوە برد و بەگشتی لەسەرەتای ١٩٩٠ش پراتیکی وەها دەرکەوت.**

پ.ک.ک هاوکات لەگەڵ ئەو تیرۆر و خەڵک کوشتنانەی، لە لوبنان کۆنفرانسێکی تری پێکهێنا و بە وتەی جومعە گیروگرفتەکانی چارەسەر کرد. چەند رۆژ دوای کۆنفرانس، هەمزە دۆستی سەردەمی منداڵیی ئۆجەلان، گوللەیەکی بەردەکەوێت و گیانی لە دەست دا. پ.ک.ک، مەتینی بە تاوانی کوشتنی هەمزە گرت و پێی راگەیاند، تۆ بە زانیاری و بە پیلانی ساری باران و محەمەد شەنەر ئەو هەڤاڵەت کوشتووە و لە ناکامدا مەتینیان گوللەباران کرد.

محەمەد شەنەر رۆژی ١٩٨٠/١/٣ لە باتمان گیرا و دوای هەشت ساڵ لە مانگی یەکی ساڵی ١٩٩٠ لە زیندانی تورکیا ئازاد کرا و چونکە لە زینداندا پەیوەندیی بە

٢١- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٥١

حیزبی شیوعی تورکیا TKPوە هەبوو. دوای ئازادبوونی چووە لای ئەوان و بەهۆی شیوعیبیەکانەوە خۆی گەیاندە یونان و لەوێوە چووە ناوەندی سەرۆکایەتیی ئۆجەلان. شەنەر لەسەر شێوەی ڕێبەرایەتی کردنی لە پ.ک.کدا لەگەل ئۆجەلان کێشەی لێ پەیدا بووە و پێی گوت: «سیر بۆ ماندوو بووی، بەسە ئەرکەکان بدە دەستی ئێمە بەڕێوەی دەبەین(٢٢).

یەک لە ڕەخنەکانی شەنەر لە ئۆجەلان و پ.ک.ک. دەست تێوەردانی پ.ک.ک لە کاری شەخسی ئەندامانی بووە. لەوانە سیاسەتی ئۆجەلانی لە سەر مەسەلەی ڕەواج بووە و ئەوەی بە ڕاست ئەزانیوە، کە پ.ک.ک ڕێگا لە کچ و کوڕەکانی ئەندامی بگری. ئیزنیان پێ نەدات شو بکەن یان ژن بخوازن.

ئۆجەلان ئەمجارەش بۆ کۆتایی هێنان بە گیروگرفت و کێشە نێوخۆیەکانی پ.ک.ک. بڕیاری پێکهاتنی کۆنکرەی چوارەمی داوە. لەو کۆنگرەیەدا فاتمە و باقی قەرار (سلێمان) لە پ.ک.ک دەردەکەن. محەمەد شەنەر لەو کۆنگرەیەدا ناوی ژمارە کادیرێکی زۆری ئاشکرا کردووە، کە پ.ک.ک بەناحەق تیرۆری کردوون و داوای لە کۆنکرە کردووە، کۆمیسیۆنێک بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو ڕەشەکوژییانە دەستنیشان بکەن. کە کۆنکرە ئەو داوایەی کردووەتە بڕیار. ناوبراو هەروەها ئاماژەی بە ژیانی گریلا کردووە و لە شارستانییەت دواوە و ویستویەتی گریلا بە ژیانی شارستانییەت ئاشنا بکات، کە لە لایەن جومعەوە ڕەخنەی لێ گیراوە. جومعە گوتوویەتی شەنەر دەیەوێ گریلا بکاتە میلیس(٢٣). کۆنگرە لە شەنەری ویست، لە گوتنەکانی پاشگەز بێتەوە. شەنەریش بە ناچاری داوای لێبوردنی لە کۆنگرە کردووە.

ساری بارانیش کە لایەنگری بۆچوونەکانی شەنەر بووە لە کۆنگرەدا، ڕەخنەی لە عوسمان ئۆجەلانی برای عەبدوڵڵا ئۆجەلان گرت و پەنجەی بۆ کەسایەتی لاوازی ئەو ڕادەکێشا. کۆنگرە ساری باران و شەنەری بۆ کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژارد و لەگەڵ گرووپێک ناردنی بۆ باشووری کوردستان، بەلام هەر کە گەیشتنەجێ، ئۆجەلان بڕیاریدا و گوتی: «پێویستە ساری باران و شەنەر دەسبەجێ بکەونە ژێر لێکۆڵینەوە(٢٤).» ئۆجەلان هەروەها گوتی: «پێویستە ئەیالەتەکان ڕاستەوخۆ گرێدراوی سەرۆکایەتی بن، نەک کۆمیتەی ناوەندی(٢٥).»

---

٢٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٦٧
٢٣- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٧٩
٢٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٨٢
٢٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٨٢

به ساری بارانیان ڕاگەیاند لەسەر هەڵەکارییەکانی خۆی ڕاپۆرت بنوسێ. ئەو بەناچار ڕاپۆرتێکی نوسی، بەڵام لێیان قەبوول نەکرد و پێیان ڕاگەیاند، پێویستە ڕەوشی خۆت بەباشی تێدا ڕوون بکەیتەوە. ئەگینا دەتکرین. هەر بەمجۆرەش لە حەفتانێن بە شەنەریان ڕادەگەیاند، کە ڕاپۆرتی خۆی بنوسێ. چونکە ناوبراو بەدڵی ئۆجەلان ڕاپۆرتی لەسەر خۆی نەنوسی. خستیانە ژێر لێکۆڵینەوە و بە تۆبزی ڕاپۆرتیان پێ نوسیوە.

مەبەستی پ.ک.ک لەو ڕاپۆرت وەرگرتنانە لە ئەندام چ بووە و بۆچی شێوازی ڕەخنە و ڕەخنە لە خۆ گرتن لە پ.ک.ک دا شێوەی ڕاپۆرت نووسینی زۆرەملێی پەیدا کردووە و ئەندام وای لێهاتووە، کە زاتی نەبێ خۆی لێ بدات؟ لە پ.ک.ک دا بۆ ئەوەی ئەندام بخەنە ژێر فەرمان، ئەو شێوە نالەباریان هەڵبژاردووە. بەپێی فەرهەنگی زاڵ بەسەر پ.ک.ک دا، سەرەتا ئەندامان بەوە تاوانبار دەکەن کە کردەوەکانیان خراپە و بەمجۆرە زەلیلیان دەکەن و دوایش دەستیان دەگرن و هەڵیاندەستێننەوە سەر پێ، بۆ ئەوەی بەخۆیانەوە گرێیان بدەن(٢٦). ئەو شێوە ڕووبەڕوو بوونەوەیە لەگەڵ ئەندامان، محەمەد شەنەر، ساری باران، فایق، نافیعە و برای شەنەر (محەمەئەمین شەنەر)ی ناچار کردووە، بە چەکەوە ڕابکەنە لای هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. شەنەر دوای ماوەیەک چووە کوردستانی ژێردەستی سوریا، بەڵام لەوێ بە فەرمانی ئۆجەلان لە ماڵێکدا تیرۆریان کرد(٢٧).

کۆمیسیۆنی لێکۆڵینەوەی ڕەشەکوژیی هەڵبژێراوی کۆنگرەی چوارەمی پ.ک.ک، ناوی دوو گروپ ئاشکرا دەکات، کە بە فەرمانی ڕێبەرانی پ.ک.ک بەنهێنی و ئاشکرا کوژراون. کۆمیسیۆن ڕادەگەیەنێ: **«ئەوانی ئەو دوو گروپە کوژراوانەی نێوان کۆنگرەکانی سێیەم و چوارەم ئەوەندە مەزن نەبووە، کە شایانی مەرگ بن».** گروپی یەکەمی تیرۆر کراوەکان سێ ئەندام بوون بە ناوی: عیسمەت دۆغرو (سەعدون)، سەلمان ئومورجان (قاسم) و عەبدوڵلا ئەکنجی (عەلی). گروپی دووەم چواردە خۆێندکاری بەرزن. یەک لەوانە بەناوی لامعە باکسی دوکتۆرێکی خوێندکاری سوید بووە، کە لە سویدەوە چووە هاوکاری پ.ک.ک بکات. ئەوانی تریش بریتین لە: سالح جیلان، سەبری ئەگە، (باقر)، فەهیم، خەیری گەدیک (دوکتۆر ئایدین)، سەلمان عومەر جان (گوزلکلوقاسم)، ئاوا ڕەش، حوسێن عەبدولسەمەد (ئەحمەد)، عەلی

---

٢٦- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٠٦
٢٧- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٠٤

**ناكتاش، جەمیل نیكە (نۆرمان)، وەیسی (محەمەد). محەمەد خۆجە، كەنال و مستەفا ئیشلەك(٢٨)**

پ.ك.ك دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ی باشووری كوردستان، لە زاخۆ و دهۆك و گوندەكانی هەرێمی بادینان، ناوەندی ARGKی دامەزراند و ئاڵای خۆی لەسەر ناوەندەكانی هەڵكرد و ئۆجەلان ویستی لە پێكهاتنی ئەو بۆشاییە كەلك وەربگری و دەسەڵاتی باشووری كوردستان بخاتە دەست. بۆ ئەو مەبەستە، سەرەڕای كەلك وەرگرتنی لە گریلا، لەو ژمارە كوردانەی باشووریش كەلكی وەردەگرت كە ساڵی ١٩٨٨ پالیان بە پ.ك.ك وە دابوو و بەشێكیان لە فێرگەی پ.ك.ك دا پەروەردە ببوون. پ.ك.ك بەم مەبەستە، پارتی ئازادی كوردستان PAKی بۆ ئەو ژمارەیە دامەزراند و ئەوی بە ئاڵتەرناتیڤی رێكخراوەكانی باشووری كوردستان ناساند. هەڤاڵ جومعە لە لاپەڕەی ٨٧ەی كتێبەكەیدا پەنجە بۆ ئەو مەسەلەیە ڕادەكێشی و دەڵێ:

**- ئێمە ویستمان لە ڕێگەی گرووپێكی باشووری مەرن كە ساڵی ١٩٨٨ تەڤلی ئێمە ببوون، موداخەلایەكی باشوور بكەین. چونكە دەمانزانی ئەو پارتی و ڕێبەرانەی باشوور نەتوانن گیروگرفتی گەل چارەسەر بكەن. بۆیە پێویست بوو پارتییەكی ئاڵتەرناتیڤ ساز بكرێت. ئەو هەڤاڵانە بۆخۆشیان خوازیاری ئەمە بوون. ئێمەش بە باشمان زانی پارتی ئازادی كوردستان PAK دامەزرێت. ئەو گرووپە بەگرانی لە ئاكادێمیا بوو، سەرۆكایەتیش گەلێك لەسەریان ڕاوەستا و یارمەتی كردن. لەسەر ئەو بنەمایە مانیفێست و پرۆگرامی خۆیان نووسی و سەرۆكایەتیش بەهۆی وەرگێڕەوە گەلێك هاوكاری كردن.**

پارتی ئازادی تا ساڵی ١٩٩٢ و ڕاپەڕینی پ.ك.ك دژی پەرلەمان و حكومەتی هەرێمی كوردستانی عێراق دەوامی كرد، بەڵام ئیتر نەیتوانی لەبەرامبەر پارتی دیموكرات و یەكێتیی نیشتمانی و ڕێكخراوەكانی تری كوردستاندا دەوام بێنێ و ئەو توند و تیژییەی بۆ نەچووە سەر كە لە پ.ك.ك دا فێری ببوو و سەرئەنجام بۆخۆی لەنێوخۆیدا توایەوە. جومعە دەربارەی پارتی ئازادی دەڵێ:

**... لە كاتێكدا PAK بۆ ئەوە دامەزرا كە بە شێوازی پ.ك.ك خەبات بكات و ئەگەر بەم شێوازە هەڵسوڕابا بە دڵنیایی سەردەكەوت. هێشتا PAK جێگەی خۆی نەگرتبوو كە ئەمریكا و ئینگلیز و فەرانسە، پارتەكانی باشووریان ڕێكخست، ئێمەش دەبوایە بەر لەوان میللەت ڕێك بخەین و لە دژی ئەم هێزانە بیانخەینە كار(٢٩).**

---

٢٨- سەرخۆبوون، ژمارەی ١١٤، ساڵی ١٠ حوزیرانی ١٩٩١
٢٩- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٨٨

ئایدیۆلۆژی دژ بە ئیمپریالیزمی پ.ک.ک و ستراتیژییەکەی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی بە خەیاڵ سۆسیالیستی لە کوردستاندا، بەبێ هیچ تێروانینێکی سیاسی وای لێکرد، کە دژی ئازاد بوونی باشووری کوردستان راوەستێ و خۆ بخزێنێتە ناو بەرەیەکەوە، کە دەوڵەتە داگیرکەرەکان بە دژی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کورد پێکیان هێناوە. ئەو بەرەیە بە حیزبوڵڵاشەوە بە رواڵەت دژی دەسەڵاتدارییەتی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا خەبات دەکات!!!

ئازاد بوونی باشووری کوردستان لە ١٩٩١/٩/٢٤ و کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی رژێمی عێراق لەو هەرێمەدا، کارگەرییەکی مەزنی کردە سەر کوردی هەموو بەشەکانی کوردستان. پ.ک.ک لەو ساڵەدا چەند زەبری قورسی لە دوژمن وەشاند و لە ئەنجامی شەهید بوونی چەند گریلای پ.ک.ک لە «باگۆک»، خەڵکی نوسیبین لە دوژمن راپەرین و بە رێپێوانێکی مەزن تەرمی کوژراوەکانیان بەخاک سپارد. دوای نوسیبین، جەزیر، مووش، بینگول، دەرسیم و بەگشتی سەرتاسەری باکووری کوردستان بووە بڵێسەی ئاگر. بەو سەرهەڵدانانە گریلاش هێندەی تر هێزی پەیدا کرد(٣٠). لەبەر ئەوە دەکرێ بڵێین ساڵی ١٩٩١ ساڵی گەشەسەندنی پ.ک.ک بوو لە کوردستان و دەرەوەی کوردستانداو لەو ساڵەدا هەزاران کەس پالیان بە پ.ک.ک وە دا.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١دا، تورگوت ئۆزاڵ سەرۆک کۆماری ئەوکاتی تورکیا، لەژێر کارگەریی جەوی رەخساودا، یاسایەکی تایبەتی دەربارەی پێکهاتنی پارتی سیاسی لە تورکیا دەرکرد و رایگەیاند، کە لە خەزێنەی گشتی دەوڵەت پارە بدەنە ئەو پارتییانەی کە بە رێگای ئاشتی و دیموکراتییەوە، هەوڵی دیموکراتیزەکردنی تورکیا دەدەن. ئۆزاڵ بۆخۆی پارتی HEP ی دامەزراند و هەلی بۆ خەڵکیش رەخساند، کە ئەوانیش رێکخراو و کۆمەڵەی دیموکراتی و پیشەیی دامەزرێنن. ژمارە کوردێک ئەو هەلەیان قۆستەوە و پارتی DEPیان دامەزراند و داوایان لە رێبەرانی پ.ک.ک کرد هەوڵ بدەن بۆ بەرژەوەندی بزووتنەوەی کوردی باکوور دژایەتی ئەو رێکخراوە نەکەن و رێکخراوەکە بە هی خۆیان بزانن. ئەو رێکخراوە ئەمرۆ بەناوی HADEP لە تورکیا خەبات دەکات و لە هەڵبژاردنی ١٩٩٩ی تورکیادا نزیکەی ٢٠٪ دەنگی کوردەکانی هێناوە. لە HADEPدا، هێشتا کەسانێک هەن کە لەبەرامبەر سیاسەتی ژینۆسایدکردنی کورد بەدەست دەوڵەتی تورکیا، لایەنگری لە سیاسەتەکانی پ.ک.ک دەکەن.

---

٣٠- هەمان سەرچاوە لاپەرەی ٥٩١



دامەزرانی ....

پ.ک.ک ساڵی ۱۹۹۱، کۆنفراسێکی بەناوی کۆنفرانسی زیندان لە ناوچەی سەرۆکایەتیدا پێکهێنا. دەوڵەتی تورکیا لەو ساڵەدا، ژمارەیەکی زۆر زیندانی سیاسی ئازاد کردبوو، کە بەشێکیان کادیر و لایەنگرانی بەرچاوی پ.ک.ک بوون. زۆر ئازایانە لە زینداندا خۆیان ڕاگرتبوو و لەبەرامبەر مەئمورەکانی حکومەتی تورکدا لاوازییان پیشان نەدابوو و بە خۆڕاگری لە زینداندا مابوونەوە. کۆنفراس لە بارودۆخی زیندان و ناکۆکی کادیرەکانی لە زینداندا کۆڵییەوە. سەکینە جانسز ئەندامی کۆنسەی (کۆمیتە) سەرۆکایەتی ئەمڕۆی پ.ک.ک، بە تۆزجەلانی گوت
- بەسە ئیتر مەئنوو بووی، ئەو کارە بە ئێمە بسپێرە(۳۱).

ساڵی ۱۹۹۲، دەوڵەتی تورکیا بۆ ئەوەی کارگەریی ڕاپەڕینی ساڵی ۱۹۹۱ی باشووور لەسەر کوردەکانی باکوور لەناو بەرێ، هێرشێکی بەربلاوی کردە سەر کوردستان و بە سەدان گوندی کوردستانی وێران کرد و دەیان کەسیشی ئاوارە کرد.

لە ۱۹/۵/۱۹۹۲، لە باشووری کوردستان هەڵبژاردنێکی ئازاد و دیموکراتی کرا و ڕۆژی ۱۹۹۲/٦/٤، بۆ یەکەم جار لە مێژووی خۆیدا پەرلەمانێکی هاوبەش لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و برا ئاشورییەکان دامەزرا. پ.ک.ک لەوکاتەدا ناسکەدا، بە بەرزکردنەوەی دروشمی ئازادیی کورد و سەربەخۆیی هەموو کوردستان، خەریکی ڕێکخستنی خەڵکی شار و گوندە ئازادکراوەکانی کوردستان بوو دژی پارتی دیموکرات و یەکێتیی نیشتمانی و بەرگری کردنی ئەمریکا و ئینگلیز و ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانی لە کوردی باشووور بە کفر و خیانەت بە کورد ناو دەبرد و ڕادەگەیاند، گەل نابێ بایەخ بە یاساکانی پەرلەمان بدات. هەروەها دەیگوت کێشەی باشووری کوردستان بەبێ پ.ک.ک چارەسەر نابێ و پارتی و یەکێتیی دەبێ پ.ک.ک ش بە لایەنێکی کێشەی کورد لە باشووری کوردستان بزانن. هەر کە پارتی و یەکێتیی ڕێگایان پێنەدا دەست لە کاری باشوور وەردا، دروشمی ڕووخانی پەرلەمان و حکومەتی کوردستانی بەرز کردەوە.

ناوەندەکانی حەفتانین، خواکورک، مەتینا و چقورچەی بەهێز کرد و لە هەندێک جێگاشدا بەناوی پارتی ئازادیی دەسکرد هەڵدەسوڕا. کۆبوونەوەی هێزەکانی پ.ک.ک لەو ناوەندانە، دەوڵەتی تورکیای هاندا، کە پەیتا پەیتا بە فڕۆکە هێرش

۳۱- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٥٩٥

بکاته سەر گوندەکانی باشووری کوردستان و زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی بە دانیشتوانی سەر سنوور گەیاند.

ئەوانە لە کاتێکدا ڕوویان دەدا، کە هێشتا ڕێبەرانی پ.ک.ک لەسەر شێوەی خەبات و چۆنیەتی بەرەنگار بوونەوەیان دژی ئیمپریالیزم لە باشووری کوردستان و تورکیا دوو دڵ بوون و نەیاندەزانی لە کوێ کەڵک لە گریلا وەرگرن و لەو هەلومەرجە ڕەخساوەدا دژی کێ شەڕ بکەن. لە باکوور هەرچەندە گەل ئامادەی گیانبەخت کردن بوو، بەڵام پ.ک.ک توانای کەڵک وەرگرتنی لە هێزی ئەو خەڵکە نەبوو، بەڵام خەباتی ئەوانیان بە ناوی خۆیانەوە تۆمار دەکرد. هەڤاڵ جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**. ئەوکاتە گەلێک مشت و مڕ دروست دەبوو، کە ئایا ساڵی ۱۹۹۲ لە باشوور شەڕ بکەین یان لە باکوور. واتە هەستمان بەو مەترسییە دەکرد کە ڕژێمی تورکیا شەڕ بهێنێتە ناو گۆڕەپانی باشوور، چونکە هێشتا هێزی سەرەکیمان لە باشوور بوو. هەروەها دەمانزانی کە PAKمان دامەزراندووە و دەخوازین لە باشوور خەبات بکەین. تەنانەت لێپرسراوی بنکەی خواکورک بۆخۆشی دەیگوت: «شەڕ دەکەوێتە باشوور و پێویستە بەکوێرەی ئەمەش ئامادەکاری بکەین.» واتە لە دەست نیشان کردنی ڕەوشی شەڕدا لاوازییەکی ئەوتۆ نەبوو، تەنیا مەسەلەی خستنی ئەو بڕیارانە لەناو پراتیکدا بوو(۳۲).**

لە پراکتیکی شەڕی چەکدارانەدا، پ.ک.ک ساڵی ۱۹۹۲، لاوازییەکی بەرچاوی نواند. لە «تاشدەلەن» ۱۲ کەسیان بەدەست هێزەکانی تورک شەهید بوون. گرووپێکیان لە «ئەرجان» لە بۆسەی دوژمن کەوت و لە ۳۰ شەڕکەر، ۲۳ کەسیان شەهید بوو و ۷ کەسیشیان بە برینداری کەوتنە دەست دوژمن(۳۳)، کە ئەوە کارەساتێکی مەزنە لە شەڕی گەرۆکی پێشمەرگایەتیدا. جیا لەوە، دەوڵەتی تورکیا لە ۱۵ی ئابی ۱۹۹۲دا، هێرشی کردە سەر لایەنگرانی پ.ک.ک و زەبرێکی قورسی لێدان. ئۆجەلان لەوکاتە دژوارەدا دژی پەرلەمان و حکومەتی کوردستان، تیۆری حکومەتی شەڕ و پەرلەمانی نەتەوەیی نوسی و بڕیاریدا بەکردەوە بۆ دامەزراندنی ئەو پەرلەمانە خەبات بکرێ(۳٤).

پ.ک.ک بەو مەبەستە ڕۆژی ۱۹۹۵/٤/۱٤، پەرلەمانێکی دامەزراند و ناوی پەرلەمانی نەتەوەیی لەسەر دانا و ویستی وەک ئالتەرناتیفی پەرلەمانی هەرێمی کوردستانی عێراق لە ئەورووپاوە بیگوازێتەوە باشووری کوردستان و بە هۆی ئەو پەرلەمانەیەوە دەست بخاتە ناو باشووری کوردستان و بە گوتنی خۆی،

---

۳۲- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦۱۱

۳۳- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦۱٦

۳٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦۲۳



دامەزرانی ....

بەرژەوەندیی ئەمریکا و تورکیا و پارتییەکانی باشووری کوردستان بخاتە مەترسییەوە. پ.ک.ک بۆ گەیشتن بەو خەوە، ساڵی ۱۹۹٥ هەوڵی دا ئەندامانی پەرلەمانەکەی لە باشووری کوردستان جێگیر بکات و حکومەتێکیش بەناوی حکومەتی زاپ لەوێ دامەزرێنێ. هەرچەندە چەند کەسێکی بردە سلێمانی و لەوێ جێگیری کردن، بەڵام تێیدا سەرنەکەوت. هەڤاڵ جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

- دژمن لەوە دەترسا کە باشووری مەزن بکەوێتە دەستی ئێمە. ئەگەر ئێمە کرانی خۆمان خستبا سەر باشوور، هیچ سیستەمێک بۆ ئێمە جێبەجێ نەدەبوو و بەرژەوەندی ئەوان دەکەوتە مەترسییەوە. ئەمە بۆ ئەمریکا و تورکیا و پەرتەکانی باشوور مەترسیدار بوو و ئەو ئۆچەنە دەبوونە بنکەیەک بۆ کوردستان و ئەوش مردنی ئەوان بوو(۳٥).

ئۆجەلان لەسەر ئەو بنەمایە دروشمی ڕووخانی پەرلەمانی کوردستانی هەلگرت و هەڤاڵ جومعە گوتەنی، پ.ک.ک لە ساڵی ۱۹۹۲وە دەستی کرد بە شەڕ دژی خەیانەت!!!

کردەوەکانی پ.ک.ک، پەرلەمانی هەرێمی کوردستانی عێراقی ناچار کرد دوای خۆپیشاندانێک، کە لایەنگرانی پ.ک.ک ڕۆژی ۱۹۹۲/٦/۲٦ لە هەولێر کردیان و سێ هاوولاتیان تێدا کوژت، بڕیارێکی گشتی لەسەر ئەو ڕێکخراوە وەرگرێ و گیرمشێوێنییەکانی لە باشووری کوردستان بخاتە بەرباس. لەو کۆبوونەوەیەی پەرلەماندا، کە ڕۆژی دووشەمە ۱۹۹۲/۸/۳۱ ئەنجامی گرت، ئەندامانی لیستەی سەوزی یەکێتیی نیشتمانی و لیستەی زەردی پارتی دیموکرات بە ئیکرایی دەنگ بڕیارباندا، کۆتایی بە ئاژاوەگێڕییەکانی پ.ک.ک لە باشووری کوردستان بێنن و ئەگەر پ.ک.ک ئامادە نەبێ وەک هێزە کوردییەکانی بەشەکانی تری کوردستان، گوێ بۆ یاساکانی حکومەتی کوردستان شل بکات، ئەوە پێش بە هەلسوڕانی لە باشووری کوردستان بگرن(۳٦).

پ.ک.ک بەو هەلسەنگاندنە هەلەیە، کە خەلکی باشووری کوردستان و پێشمەرگەکانی پارتی دیموکرات و یەکێتیی نیشتمانی ئامادە نابن دژی ئەو شەڕ بکەن و پارتی ئازادی ڕیشەی لەنێو خەلکی باشووری کوردستاندا داکوتاوە، گوێی نەدایە بڕیارەکانی پەرلەمان. لە ئاکامدا، پێشمەرگەکانی یەکێتی و پارتی لە بەرامبەریاندا ڕاوەستان و لە شەڕێکی خوێناویدا، نزیکەی ۱٦۰ گریلایان لێ کوشتن و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل گرتن. ئۆجەلان هەرکە هەستی بەو

۳٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦۲۳

۳٦ پرۆتۆکۆلی دانیشتنی ژمارە ۲۷ی پەرلەمانی کوردستان، ڕێکەوتی ۱۹۹۲/۸/۳۱

شکستە مەزنەی هێزەکانی کرد، ئاگربەسی ڕاگەیاند و گوتی: لەمەولاش ڕێز لە یاساکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەگرن و گریلا بەپێی یاسا لە باشووری کوردستان دەجوڵێنەوە. بە گوێرەی ئەو ڕاگەیاندنەی ئۆجەلان، شەڕ ڕاگیرا و پارتی و یەکێتی دیلەکانیان ئازاد کرد و ڕێزیان بە ئەندامانی پ.ک.ک دا لە شارو گوندەکانی باشووردا بمێننەوە. جومعە دەربارەی ئەو شەڕە دەڵێ:

**- لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٢ لە شەڕی باشوور، ئەگەر سەرۆکایەتی پارتی تەدبیری وەرنەگرتبا، بەتەواوی لەناو دەچووین. چونکە خواکورک دەستی لە شەڕ بەردا و ئێمەش کەوتبووینە گەمارۆ(٣٧).**

مەڤاڵ جومعە هەروەها لە لاپەڕەکانی ٦٢٢-٦٣١ی کتێبەکەیدا پەنجە بۆ ئەنجامەکانی ئەو شەڕە ڕادەکێشێ و لە خاڵی سێیەمی ڕوونکردنەوەکەیدا دەڵێ:

**- ئەگەر لەو شەڕەدا بەپێی تاکتیک هەنگاومان هەڵێنابا، بیری ئۆتۆنۆمی و فیدراڵی دەسڕانەوە و ئەم کۆسپانە نەدەمان. بیری سەربەخۆیی و ئازادی لە کوردستاندا بە تەنیا دەمایەوە و حاکمیەتی خۆی سەقامگیر دەکرد.** ناوبراو هەروەها دەڵێ:

**- بۆ هەرکەس ڕوون بێوە کە مەسەلەی کوردستان بەبێ پ.ک.ک چارەسەر نابێ.**

شەڕی ١٩٩٢ی پ.ک.ک دژی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان، قەیران و ئاڵۆزییەکانی ناو پ.ک.ک ی مەزنتر کرد. تەرزی جەمال ١٧ ئەندامی پ.ک.ک ی بە تاوانی سیخوڕی بۆ دوژمن کوشت و بۆخۆشی کەوتە بەر لێکۆڵینەوەی سەرزکایەتی و گوللەبارانیان کرد(٣٨). فەرهادی برای ئۆجەلان بە ١٨٠٠ گریلا لە زەڵێ مانی گرت و دژی شەڕ و ئاژاوەگێڕی پ.ک.ک ڕاوەستا و لە ئەنجامدا ئۆجەلان ناوبراوی لە بەرپرسایەتی کۆمیتەی ناوەندی خست. فەرهاد، پ.ک.ک ی بەجێهێشت و پەنای بۆ ئێران برد، بەلام ئۆجەلان، فەرهادی گەڕاندەوە و لە کۆنگرەی پێنجەمیدا، چەمکی ڕیفۆرمیستی لە کەسایەتی ئەودا مەحکوم کرد(٣٩).

کێشەی ناوخۆی پ.ک.ک لە لایەک و کەم ئەزموونی کادیرەکانی لە بەڕێوەبردنی خەباتی نهێنی و جەماوەریی دژی دەوڵەتی فاشی تورکیا لە لایەکی ترەوە، زۆربەی ئەندامان و لایەنگرانی ئەو ڕێکخراوەی لە شار و بەتایبەتی لە گوندەکانی باکووری کوردستاندا بۆ دوژمن ئاشکرا کرد. دەوڵەتی تورکیا بە کەلک وەرگرتن لە خەباتی بە ئاشکرای لایەنگرانی پ.ک.ک، ژمارە گوندێکی تریشی لە باکووری کوردستان

---

٣٧- مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان لاپەڕەی ٦٣٢
٢٨- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٣٨
٢٩- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٢٩-٦٤٤

جۆلکرد و نزیکەی نۆ هەزار کەسیش راپاکردە باشووری کوردستان. کە سەرەتا بە هۆی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کەمپی مەخمور، جێگیر کران و پاشان بە دەست نیوەردانی لیبەرسراوانی پ.ک.ک لە ژیانی ئەوان. کێشەیەکی زۆری بۆ ئەوان و حکومەتی کوردستان خولقاند، کە ئەویش داستانێکی تایبەتی بەخۆی هەیە و کتێبێکی بە ناوی «کەمپی مەخموور - راستییەکان و ناکار و کردەوەکانی پ.ک.ک» بە زاراوەی کرمانجی لەسەر نوسراوە. تورکیا هەروەها گوشارێکی زۆری خستە سەر ئەندامان و لایەنگرانی پ.ک.ک و پەیوەندی نێوان گریلا و جەماوەری باکوور کوردستانی لێک پچڕاند. هەڤال جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

- وەکوو پێشتر گوتمان، دوژمن بە چۆلرسەندنی میللەت پێشی سەرهەلدنی گرت و بە چۆلکردنی گوندەکان گەل و گریلای لە یەکتر دوور خستەوە. یەکێک لە هۆیەکانی لەناو چوونی پەیوەندی گریلا و جەماوەر ئەوە بوو کە ڕێکخراوەکانی بەرەی ئێمە بە ئاشکرایی کاریان دەکرد نە نهێنی و هیچ حیسابی دوژمنیان نەدەکرد. هەمووشتێک ببوو بە ئاشکرا و کامە گوند و کامە دۆستی ئێمەیە و کێ لە ناو کۆمیتەکانی ئێمەدا کار دەکات و کێ پەیوەندی لەگەڵ ئێمە هەیە، لە شار و گوندەکان، هەموویان دەیانزانی. دوژمنیش کەلکی لەمە وەرگرت و چووە سەر ڕێکخستنەکانی ئێمە و هەمووی پرش و بڵاو کردەوە. هەوکات لەگەڵ ئەمەش بە ئۆپەراسیۆن دەچووە سەر گریلا. گریلاش وای لێهاتبوو کە نەک هەر نەیدەتوانی شەڕ بکات، بەڵکوو نەدەتوانی کێشەکانی لۆجستیک و جبەخانەی خۆشی چارەسەر بکات(٤٠).

هەرلەو ساڵەدا (١٩٩٤)، پ.ک.ک بەهۆی زەبر لێکەوتنەکانی و دەوڵەتی تورکیاش بەهۆی ڕاپەڕینەکانی پەیتا پەیتای گەل، لە قەیرانێکی قوڵی سیاسیدا نوقم بوون. ئۆجەلان وەک هەمیشە بۆ ئەوەی پ.ک.ک لەو قەیران و تەنگژەیە ڕزگاری بکات، بڕیاری پێکهێنانی گۆنگرەی پێنجەمی ڕاگەیاند. چونکە دوای شەڕی ١٩٩٢، کۆمیتەی ناوەندی هەڵوەشابوو و پ.ک.ک کۆمیتەی ناوەندی نەبوو، ئۆجەلان کۆمیتەیەکی ئامادەکاری کۆنگرەی پێکهێنا، تا پێویستییەکانی کۆنگرە ئامادە بکات.

کۆنگرە بەبێ ئامادەبوونی ئۆجەلان لە مانگی چواری ساڵی ١٩٩٥، لە باشووری کوردستان پێکهات. ئۆجەلان ئامۆژگارییەکان و فەرمانەکانی بە ڕێگای تەلەفۆنەوە

٤٠- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٤٧

به كۆمیتەی ئامادەكاری كۆنگرە و ئەندامانی بەشداری كۆنگرە رادەگەیاند. ئۆجەلان لەوكاتەدا كە كۆنگرە خەریكی بەڕێوەبردنی كارەكانی بوو، بڕیاری پێكهێنانی كۆنگرەی یەكێتی ئازادی ژنانی كوردستان YAJKبشی راگەیاند. كاتی كۆنگرە، پارتی دیموكرات و یەكێتیی نیشتمانی خەریكی شەڕی خۆكوژی بوون، ئۆجەلان بە كەڵك وەرگرتن لەو هەلە بە كۆمیتەی ئامادەكاری كۆنگرەی راگەیاند، بۆ لە دەسەڵات خستنی ئەو دوو رێكخراوە شەڕكەرانە، پێویستە دەست پێشخەری بكەن و بە زووترین كات بكەونە جووڵە و زاخۆ بگرن و ئەو شوێنە لە پێشمەرگەكانی پارتی پاك بكەنەوە، بەڵام كۆنگرە بۆ ئەوەی كارەكانی بەنیوەچڵی نەهێڵێ، فەرمانی ئۆجەلانی بۆ دوای تەواوبوونی كۆنگرە هێشتەوە. هەڤاڵ جومعە لەم بارەیەوە نووسیویەتی:

**- سەرۆكایەتی فەرمانی ناردبوو كە ئێمە دەتوانین ئەو هێزە ئالتەرنەتیفە بین، بۆ ئەوە پێویستە هەرچی زووتر بكەوینە جووڵە و دەست پێشخەری بكەین، سەرۆكایەتی دەیگوت: بەرلە هەموو شتێك پێویستە زاخۆ بگرن....، لە لایەك زستان بوو، لە لایەكیش كۆنگرە بەڕێوە دەچوو. ئێمە نەماندەویست كۆنگرە بخەینە بەر مەترسی و لەسەر ئەوەش گفتوگۆیەكی توند لەنێوان من و هەڤاڵان دەركەوت. من دەمزانی ئەگەر ئەوكارە بكەین، بێ سێ و دوو توركیا موداخلە دەكات و ئێمەش ناتوانین كۆنگرە سەز بكەین. واتە پێویست بوو لەنێوان شەڕ و كۆنگرە یەكێكیان هەڵبژێرین و هەر دووكیان بەیەكەوە نەدەبوون. لەبەر ئەوەش دەمگوت: ،هەرچی زووتر كۆنگرە تەواو بێت و دەست بە ئامادەكاری بكەین(٤١).**

كۆنگرە پەیرەوی ناوخۆی ARGKی گۆڕی و بە وتەی جومعە پەیرەوێكی نوێی بەگوێرەی بارودۆخی ئەوكاتی دنیا و سۆسیالیزم و كوردستان بۆ ئامادە كرد. كۆنگرە هەروەها لەسەر فەرمانی ئۆجەلان پلانی راكێشكردنی ئەرتەشی توركیای بۆ ناو خاكی هەرێمی كوردستانی عێراق خستە بەرباس. جومعە دەربارەی ئەو باسەی كۆنگرەی پێنجەمی پ.ك.ك دەڵێ:

**- ئێمە بە گوێرەی ئەو پیلانە خۆمان ئامادە دەكرد كە بەر لە كات دژمن راكێشینە بەشوور و زەبری گەورەی لێبدەین. بێگومان دژمنیش لەوە تێگەیشتبوو، لەبەر ئەوەی ئێمە ئەو بڵاوكراوەیەمان لەسەر بێتەڵ خوێندەوە تا هەڤاڵان لەسەر بنچینەی كۆنگرە ئامادەكاری خۆیان بكەن و لەسەریان پەروەردە ببەن(٤٢).**

---

٤١- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٥٥
٤٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٥٧

پ.ک.ک دوا بەدوای تەواو بوونی کۆنگرە، لە زاخۆ هێرشی کردە سەر بارەگاکانی هێزی تورکمانەکان و راپانگەیاند. ئەوانە هێزی تورکیان و لە ئاکامدا زەبرێکی قورسی لێوەشاندن. ئینجا بە مەبەستی راکێشکردنی ئەرتەشی تورکیا بۆ باشووری کوردستان، لە دوورەوە سەربازگەیەکی تورکان گوللە باران کرد. جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

- ... سەربازگەیەکی سەر سنوور هەبوو کە دەمانتوانی هەندێ ئەندامی لەوێ دەگرێ، ویستمان لەو سەربازگەیە بدەین ئاکوو هەڵوێستی تورکیاش ببینین، ئاکوو تورکیا بخەینە کوردستانەوە و بە رق و کین و بەبێ ئەندامێکی بکەوێنە باشوور و زەبری کاریگەری لێبدەین(٤٣).

ئۆجەلان بەبێ هیچ ئامادەکارییەکی پێشوو هاوکات لەگەڵ کۆنگرەی پێنجەم، بە تەلەفۆن، کۆنگرەیەکیشی بۆ ژنانی پ.ک.ک پێکهێنا. هەربە تەلەفۆن ئەرکی ئەوانی دابەش کرد و هەرکامەیانی ناردە شوێنێک(٤٤).

لەگەڵ کۆتایی کۆنگرە، چەند گرووپیان رەوانەی ناوچەکانی ئەرزڕووم، دێرسیم و دیاربەکر کرد، تا دوای راکێشکردنی دوژمن بۆ ناو خاکی هەرێمی کوردستانی عێراق، ئەوانیش لەوێ دوژمن پەلامار بدەن، بەڵام ئەو گرووپانە لە ناوچەی جودی کەوتنە کەمینی دوژمن و زیانێکی قورسیان لێ کەوت(٤٥).

پ.ک.ک بەمجۆرە ئەرتەشی تورکیای کێشایە ناو باشووری کوردستان کە بە هەرێمی کوردستانی عێراق دەناسرێ. بە هاتنی ئەرتەشی تورکیا بۆ باشوور، چونکە گریلاکان ورەی بەربەرەکانیان دژی ئەرتەشی تورکیا نەبوو! بەر لە هەموو لایەنێک هەوڵیان داوە خۆیان لە مەترسی رزگار بکەن. بەم مەبەستە، سەرەتا یەکێتیی ژنانیان بەرەو چیای گاری نارد و پاشانیش بۆخۆیان راپانکرد و باشووریان خستە ژێر پۆستاڵی سوپای جنایەتکاری تورکیا. رێبەرانی پ.ک.ک بەبێ لەبەرچاو گرتنی ورەی خۆیان و گریلاکانیان، پشتیان بەو گوتنەی ئۆجەلان بەست، کە گوتبووی «باشووریان لێ دەکەین بە ڤێتنام» و بەمجۆرە ویستیان هەموو کوردستان بدەنە دەست تورکان. جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

---

٤٣- هەمان سەرچاوە لاپەرەی ٦٥٦
٤٤- هەمان سەرچاوە لاپەرەی ٦٥٩
٤٥- هەمان سەرچاوە لاپەرەی ٦٥٨

**. دەیەزانی ئەگەر شەر بکێشرێتە سەرتاسەری باشوور، ئەو کۆڕەبەنەیان بۆ دەبێتە کوردستان و قسەی سەرۆکایەتی وەدی دێت کە بەرلە هێرشەکە گوتبووی :باشووریان بۆ دەکەینە قیتنام،، دوژمن بەڕاستی دەترسا و بۆ ئەوەی نەکەوێتە زەلکاوێکی وەهاوە، دەیەویست گورج و گۆڵ زەبری خۆی بوەشێنێ.... و لە حەوتوویەکدا ئەو ناوچەیە بخاتە بن کۆنترۆڵی خۆی... ئەگینا زەبری گەورەتریان دەخوارد. ئەوکاتە باکوور و باشوور دەبوونە یەک و پ.ک.ک دەبوو بە پارتییەکی ڕەسمی لە باشوور و لە لایەن دەوڵەتان و ڕای گشتی جیهانیشەوە دەناسرا، بەڵام ڕای گشتی جیهان تورکیای ناچار کرد باشوور بەجێ هێڵێ و بگەڕێتەوە ناو سنوورەکانی خۆی(٤٦).**

پ.ک.ک بەگوێرەی پلانی کۆنگرەی پێنجەمی، ئەرتەشی تورکیای کێشایە ناو هەرێمی کوردستانی عێراق، بەڵام چونکە نەیتوانی لەبەرامبەریدا ڕاوەستێ، دەستی کرد بە پڕوپاگەندە و تاوانی هێرشی ئەرتەشی تورکیای خستە سەر پارتی دیموکراتی کوردستان. پ.ک.ک لە چوارچێوەی ئەو پڕوپاگەندەیەیدا لە حەفتانینەوە هێرشی کردە سەر پارتی دیموکرات، بەڵام لەوێش شکستی خوارد و زەبرێکی قورسی لێ کەوت. جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**- ئەوکاتە هەڤاڵان لە حەفتانین ویستبوویان زەبرێک لە PDK بدەن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئامادەکارییان نەبوو، زەبرێکی مەزنیان خوارد و گەلێک شەهیدمان دا. ئەودەم من لە ئێران بووم و پاش ئەو ڕووداوە لەگەڵ هەڤاڵان بە تەلەفۆن قسەم کرد و پێم گوتن کە بچن خۆیان تەسلیم بکەن لەو شێوازە باشترە. لە کاتێکدا ئێمە لە PDK بەهێزتر بووین و PDK دەبوایە لە ئێمە بترسێ، بۆ دەبێ ئیزن بدەین ئەو کارانە بکەن و جەسارەت وەرگرن(٤٧).**

پ.ک.ک ساڵی ١٩٩٥، ئەنجامێکی باشی لە بڕیارەکانی کۆنگرەی پێنجەم وەرنەگرت. لەو ساڵەدا، دژی تورکان جووڵەی لێبڕا، بەڵام لە باشووری کوردستان هەندێک دەسکەوتی هەبوو، ئەویش بە ئازاردانی خەڵکی ئەو جێیە و ئاژاوە دروست کردنی بۆ ڕێکخراوەکانیان. جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**- ئێمە لە ساڵی ١٩٩٥دا ئەنجامێکی ئەوتۆمان وەرنەگرت و دەرئەنجامەکانی کۆنگرەی پێنجەم ئەهاتە بواری کردارییەوە. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە تورکیا لە ساڵی ١٩٩٤دا پەیوەندی نێوان گەل و گریلای پچڕاندبوو و ڕێگەی لۆجستیک و ئازووقەی لە ئێمە**

---

٤٦- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٦٠-٦٦١

٤٧- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٦٢

**بڕیبوو. ئەگەرچی ئەو مەسەلەیە لە ساڵی ٩٤دا زۆر خۆی نەنواند، بەڵام لە ساڵی ٩٥دا ئێمەی تووشی قەیران و تەنگەنە کرد. کاتێ هەڤاڵ دەکەونە تەنگەنە و بڕسێتی، ئەوکات ئەوانەی لاوازن، دەکەون و پارتی بە مەسەلەی ئەوخۆوە خەریک دەبێ و ئەتوانێ بەپێی پیلانەکانی بجووڵێتەوە. بەو شێوەیە ساڵی ٩٥ زۆر بەگرانی دەربازبوو. ئەگەر لەو ساڵەدا هەندێکیش دەسکەوتمان هەبوو بە بۆنەی شەڕی باشوور بوو نە باکوور(٤٨).**

شکان و پاشەکشەکانی پەیتا پەیتای پ.ک.ک لە تورکیا و باشووری کوردستان و خۆخزاندنی گریلاکانی لە ئێران و ڕۆژهەلاتی کوردستان، بەرمبەرە کادیر و گریلاکانی پ.ک.ک ی داهێزاند و ڕێبەرایەتی پ.ک.ک وەک پێویست نەیتوانی کەڵکیان لێ وەرگرێ. هەڤاڵ جومعە لەم بارمیەوە دەڵێ:

**- دەوڵەتی ئێران بە ئەنقەست ڕێگەی گوندەکانی دەکردەوە تاکوو هەڤاڵانی ئێمە لەو گوندانە فێری ئاکاری خراپ ببن و لە کەسایەتی میلیتان دەرکەون. بۆیە هێزەکانی سەرسنووری ئێرانمان وەکوو چەتە و ڕێگریان لێهاتبوو و دەستیان لە شەڕ و پارتی بە جارێک بەردابوو. تواناکاری زۆر بوو، ئەوانیش دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و کەوتبوونە شوێن ڕاحەتی خۆیان(٤٩).**

جومعە بۆ چارەسەرکردنی ئەو لاوازییە، دەچێتە ئێران و چەند جارێک لەگەڵ کاربەدەستانی ئێران کۆدەبێتەوە. کاتێ لە ئێران دەبێ، ئۆجەلان پێی ڕادەگەیەنێ و دەڵێ پارتی دیموکرات پێشنیاری کردووە بە ڕێگای سیاسی کۆتایی بە شەڕەکەمان بێنین، بۆیە پێویستە بگەڕێتەوە باشووری کوردستان و کێشەکە چارەسەر بکەی. جومعە لەم بارمیەوە دەڵێ:

**- سەرۆکایەتی گوتی: بچووە مەسەلەی ئێمە و PDK هەیە، بە دوایین قسە و کۆبوونەوە کۆتایی پێ بێنە.، کاتێ گەیشتمە هەولێر بەرلەوەی بچمە لای PDK تەلەفۆنم بۆ سەرۆکایەتی کرد و دوایین ڕێنوێنیم وەرگرت، پاشان بەرەو سەلاحەددین وەڕێ کەوتم. هەم سەرۆکایەتی و هەم هەڤاڵانی بڕیارگەی ئەوەندی ئاگاداری چوونی من بوون بۆ سەلاحەددین. ڕەوشێکی گەلێک خراپ بوو، لەوانەبوو هەر ئێستا نا ئێستا لە نێوان ئێمە و PDK شەڕ دەست پێ بکات. PDK زۆر دەترسا چونکە هەڵگیرسانی شەڕێکی وەها لە بەرژەوەندی ئەودا نەبوو، لەبەرئەوەی نێوانی لەگەڵ YNK باش نەبوو، بۆیە**

---

٤٨- هەمان سەرچاوە لاپەرەکانی ٦٦٢
٤٩- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٦٣

ئەیدەویست لە هەردوولاوە بکەوێتە شەڕ. لەسەر ئەو بنەمایە دوای لە ئێمە کردبوو بچین لەگەڵی دانیشین و کێشەکەمان بە ڕێگەی سیاسی چارەسەر بکەین. دیارە ئێمەش تا ئەوکاتە هەڵوێستێکی وەهامان دیاری کردبوو.

دانیشتنەکە لە کەش و هەوایەکی باشدا دەربازبوو. بەئاشکرا گوتمان: «چارەنووسی هەردوو پارچە بەیەکەوە گرێدراوە، بەو پلانەی ئێوە دەیگێڕن بشووریش لەناو دەبەن. دوو ڕێگەتان لە پێشە، یان ببنە دۆستی ئێمە و بناغەیەکی پتەوی دۆستایەتی دابڕێژین، یان ببنە دژمنمان و ئەنجامەکەشی دیارە. ئیتر کامەیان قەبووڵ دەکەن دەمێنێتەوە سەر ئێوە، بۆ ئێمە هەردووکیان باشە، ئێوەش وا باشترە بەپێی بەرژەوەندی خۆتان هەڵسوکەوت بکەن». .... من دەمەویست هەر ئەو ڕۆژە کۆبوونەوە کۆتایی پێ بێت و بگەڕێمەوە لای هەڤالان، بەڵام سامی عەبدالرحمن دوای نان خواردن گوتی: «ئەگەر بەیانیش دانیشتنەکەمان بەردەوام بێت، باش دەبێ». منیش گوتم: «زۆرباشە، مادام ئێوە دەخوازن سەرلە بەیانی درێژە بە کۆبوونەوەکەمان دەدەین». من حیسابی ئەوەم لەگەڵ خۆم دەکرد کە هەتا مەسعود یا نێچیر لەوێ نەبێ ئەوان ناتوانن بڕیارێک بدەن، چونکە ئیرادەی ئەوەیان نییە، هەربۆیە دەیانەوێ لەگەڵ ئەوان قسە بکەن و بەیانی وەڵاممان بدەنەوە. دوای ئەمە لە سەلاحەددین دەرکەوتین و هاتینەوە هەولێر.

کاتێ گەیشتینە هەولێر، شەو درەنگ چەند هەڤاڵ هاتنە لامان. لێم پرسین «بۆ بەو شەوە درەنگە هاتوونە ئێرە؟» گوتیان: «هەڤاڵ ابوبکر ئێمەی ناردووە تا ئێوە لەگەڵ خۆمان دەست بەجێ ببەینە زاپ، چونکە لەوانەیە بەیانی ڕێگە بگیرێ». منیش پێی سەیر بوو و گوتم: «خێرە، چ بووە؟» گوتیان: «ئێمە نازانین هەڤاڵ ابوبکر گوتویەتی هەتاکوو بەیانی ئێوە بگەیێننە لای». منیش لەگەڵ خۆم گوتم، دیارە شتێک قەوماوە و لەوانەیە شەڕ دەست پێبکات، بەڵام بۆچی من خەبەرم لە هیچ نییە. گوتم لەوانەیە پەیوەندی پچڕابێ بۆیەش ئەم هەڤاڵانەی ناردووە. ئیتر منیش بەو هەڤاڵانەی ترم گوت، سبەی ئەچنە سەلاحەددین، چونکە لەوانەیە شەڕ ببێت. لە کۆتاییدا بڕیارماندا لەپێشدا گوێ لە گفتوگۆی ڕۆژانەی بێتەل رابگرین تاکو ڕەوشەکە تێبگەین، پاشان ئەگەر شتێک ئەبوو وەڕێ بکەوین. ئەگەر پرسیاریشیان کرد بۆ وا درەنگ هاتوون، دەڵێین سەیارەکەمان خراپ ببوو. سەعاتی 10ی بەیانی بێتەلمان کردەوە و زانیمان کە هەڤاڵان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردووەتە سەر PDK، بۆیە لە ڕۆیشتن بۆ سەلاحەددین پاشگەز بووینەوە.

ڕەوشێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، ڕاست لەو ڕۆژەدا کە دەبوایە بچین ناکامی کۆبوونەوەکە

**دەستنیشان کەین، هێرشیان کردبووە سەر PDK. تەنانەت ئەوکاتەش بە بێتەڵ بە هەڤاڵ ابوبکرم گوت: ئێوە چیتان کرد؟ ئێمە لە گفتوگۆدا بووین و هەتا ئەمرۆش دانیشتنەکە درێژەی هەبوو. لە وەڵامدا گوتی :هیچ نییە، دەتوانن گفتوگۆی خۆتان بەردەوام بکەن. بینیم هەڤاڵ بۆخۆشیان نازانن چ دەکەن و بەو چالاکیانەی کردبوویان و زەبریان لە PDK دابوو سەرخۆش بوون(٥٠).**

پ.ک.ک بەمجۆرە لە لایەک جومعەی نارد بۆلای پارتی دیموکرات تا بە ڕێگای سیاسی کێشەکەیان چارەسەر بکات و لە لایەکی دیکەشەوە، لە جەوی پێکهاتوو کەڵکی وەرگرت و لە کاتی وتووێژکردندا، هێرشی کردە سەر بنکەکانی پارتی و بەپێی ڕاگەیاندنی خۆی لە تەلەفزیۆنی MEDtv، دەستی بەسەر ٢٥ بنکەی پارتی داگرت و ویستی هەموو ناوچەکە بخاتە دەستی خۆی. پ.ک.ک ڕۆژی یەکەمی شەڕ زۆربەی ناوچە ستراتیژییەکانی گرت، بەڵام پارتی بە دژە هێرشێکی کوتوپڕ، گریلاکانی پ.ک.ک ی شکاند. گریلا بۆ یەکەمجار لە مێژووی پ.ک.کدا، بەهۆی لێ کەوتنی قورس، زمانی کرایەوە و تاوانی شەڕەکەی خستە سەر ئۆجەلان و گوتیان: ئێمە دژی کورد شەڕ ناکەین و ئەم شەڕە بە قازانجی شۆڕش نازانین. تەنانەت زۆربەی لێپرسراوەکانیش بەدڵ خۆیان نەدایە بەر شەڕەکە و وەک جومعە دەڵێ، گوتیان: «بە تۆبزیی ئۆجەلان و فەرمانی ئەو شەڕیان دەست پێکردووە.» جومعە دەربارەی هەڵوێستی گریلا و فەرماندەکانی شەڕی ١٩٩٥ دەڵێ:

**لە ناو شەڕیشدا وایان هەڵسوکەوت دەکرد کە ئەمە خواستی خۆتە و بۆخۆت (سەرۆکایەتی) ئەم شەڕەت دەست پێکرد. واتە ئەمە شەڕی سەرۆکایەتییە، نەک هی پارتی(٥١).**

ئۆجەلان ئەمجارەش وەکوو جارانی ڕابردوو، کە بینی هێزەکانی لە پاشەکشەدان، یەک لایەنە ناگربەسی ڕاگەیاند و پارتی دیموکراتیش قەبووڵی کرد(٥٢).

ئۆجەلان دوای ناگربەس، سەرلەنوێ هەوڵی دا، دانیشتنێک لەگەڵ پارتی پێک بێنێ و بە هەڕەشەکردن لە هەڵگیرساندنەوەی شەڕ و وێرانکردنی باشووری کوردستان، داواکارییە ناڕەواکانی بەسەر ئەواندا بسەپێنێ. پ.ک.ک لە ڕابردوودا

---

٥٠- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٦٤-٦٦٦

٥١- هەمان سەرچاوە لاپەڕەکانی ٦٦٨

٥٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٦٩

گەلێک جار بەهەڵە لە نەرم و نیانی پارتی دیموکرات گەیشتبوو و هەڵوێستی ناشتیخوازانەی ڕێبەرانی پارتی بە ترسنۆکی لە قەڵەم دابوو. ئەوان وا تێگەیشتبوون، کە پارتی لە ترسان هەڵسوکەوتی نەرم پیشان دەدات و لە ڕاستیدا ئەو شێوە نەرم بوونەی پارتی، ڕێبەرانی پ.ک.ک و بە تایبەتی ئۆجەلانی تووشی هەڵە کرد. پ.ک.ک دوای هەر شەڕێک لەگەڵ پارتی دیموکرات دەڵێ، پارتی لاوازە و شەڕی پێ ناکرێ و لەترسان مل دەدات بە ئاگربەس. ئەوان بیریان لەوە نەدەکردەوە کە شەڕی کورد کوژی لەژێر هەر ناوێک و بۆ هەر ئایدیۆلۆژییەک بێ، تاوانێکی مەزنی نەتەوەییە و ئەوانەی خۆیان لە بەرامبەر کۆمەڵی کورددواریدا بە بەرپرس دەزانن و هەوڵ دەدەن گەلەکەیان ئازاد بکەن، پێویستە بۆ بەرژەوەندی گشتیی گەل، ئەریتی نەرمیان هەبێ و هەموو شتێک بە توند و تیژیی جێبەجێ نابێ. جومعە دەربارەی ئاگربەسەکەیان و هەوڵدانیان بۆ وتوویژی دووبارە دەڵێ:

**- دوای ئاگربەس سەرۆکایەتی فەرمانی نارد کە بە هەندێ هەڤالی ژێر گفتوگۆ دەست پێ بکەن، پاشان لە ئاستی بەرزدا بە ئەنجامی بگەیەنن. لەسەر ئەو بنەمایەش چەند هەڤاڵمان ناردە هاوینەهەواری سەلاحەددین تا بزانین ئامی زاری PDK چییە! ئەوکاتە هەر داوایەکمان لە PDK کردبا، قەبوولی دەکرد. چونکە دەترسا دەست بەشەڕ بکەینەوە. نەشیاندەویست کەس ئەم ڕاستییە بزانێ و دیسانیش خۆیان بەهێز نیشاندەدا، کەچی وانەبوو و ئێمە بەوەمان دەزانی. بۆیە بە هەڤالانم گوت کە ئێمە دەتوانین زۆر بە ئاشکرا قسە بکەین و وەفدی PDK بکێشینە ژاپ، تا لێرە گفتوگۆکانمان ئەنجام بدەین. ....هەڤالان ئەمەیان بە PDK گوتبوو، ئەوانیش دەست بەجێ قەبوولیان کرد(٥٣).**

پارتی وەفدێک دەینێرێتە ئامێدی، بەلام هیچکام لە لێپرسراوانی سەرەوەی پ.ک.ک لە ترسی ئەوەی کە ئەوەکو سبەی بەرپرسایەتیان بکەوێتە ئەستۆ، ئامادە نابن بەرپرسایەتی وتوویژەکەیان بگرنە ئەستۆ، بۆیە ئەبوبەکر و گروپەکەی دەنێرن بۆ ئەو وتوویژە. پ.ک.ک ویستی وەفدی پارتی بکێشێتە ناوچەی ژێردەسەلاتی خۆی و لەوێ لەگەڵی کۆبێتەوە و بە پشت بەستن بە هێزەکانی لەو جێیە، داخوازییەکانی بەسەردا بسەپێنێ، بەلام ئەندامانی وەفدی پارتی ڕازییان دەکات بچنە سەلاحەددین. ئەبوبەکر لە هەولێر بەشوێن هەڤال جومعەدا دەنێرێ، کە بێت بەرپرسایەتی کۆبوونەوەکە بگرێتە ئەستۆ. هەڤال جومعە دێ، بەلام نازانێ لەسەر چ

---

٥٢- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٦٩-٦٧٠

بنچینەیەک گفتوگۆ بکات، لەبەر ئەوە بە توندی لە ئەبوبەکر تورە دەبێ و دەڵێ:

**دوای ئەو هەمـووە شـەڕ و شـەهیـدانە چۆن دەتوانن بەو شـێـوەیە بێنە بەرپێی دوژمن(٥٤).**

هەڤاڵ جومعە لەگەڵ ئەو گروپە دەکەوێ و لەگەڵ سامی عەبدولرەحمان و چەند نوێنەری تری پارتی دیموکرات کۆدەبێتەوە. کۆبوونەوەکە سێ ڕۆژ دەخایەنێ و پارتی بەشێک لە داواکارییەکانی پ.ک.ک قەبووڵ دەکات. جومعە دەربارەی ئەو دانیشتنە و ئاکامەکەی دەڵێ:

**... لە ترسی ئەوە کە دەست بەشەڕ بکەینەوە، هەموو خواستەکانی ئێمەیان قەبووڵ کرد. ... دیارە تەواو ئەو شتەی ئێمە دەمانەویست پێک نەهات، بەڵام ئەوەی پێکمان هێنابوو خـراپ نەبوو. ...ئامـانج دروست کـردنی ئەوەنێکی ئازاد و دیموکـرات بوو لە باشووری کوردستان، کە هەرکەسێک بتوانێ بە ئازادی بۆچوونی خۆی بێنێتە زمان و ڕێی کەس نەگیرێ. دەسەڵاتێکی دیموکراتیک دروست بێ، حکومەت و پەرلەمانی فیدراڵی بێنە حکومـەت و پارلەمـانی دیموکـراتیک و لەسـەر ئەم بنچینەیە بکەونە خزمـەتی هەموو کوردێک، نەوەک تەنیا خزمەتی دوو پارتی یان پارچەیەک بکات(٥٥).**

ئەو کۆبوونەوەیە کۆتایی بە کێشەی پارتی و پ.ک.ک هێنا، بەڵام سەرلەنوێ شەڕ بە هێرشی دووبارەی پ.ک.ک بۆ سەر پارتی هەڵگیرسایەوە و داخەکەم هەتا ئێستاش کە من خەریکی نوسینی ئەو تەوەرەیەم کۆتایی پێ نەهاتووە.

پ.ک.ک کە دەبینی لە شەڕەکانیدا شکستی هێناوە، تاوانی بەشێک لەو شەڕانەی دەخاتە ئەستۆی یەکێتیی نیشتمانی و دەڵێ یەکێتی دەستی هەبووە لە خۆشکردنی ئاگری شەڕی نێوان پ.ک.ک و پارتی دیموکراتدا. هەڤاڵ جومعە لەم بارەیەوە دەڵێ:

**YNK لەسەرەتادا دەیهەویست شەڕی خۆی و PDK بکاتە شـەڕی PDK و پ.ک.ک، تەنانەت هەندێ چەکی ئێمەشی لە دهۆک بە دەستی PDK بەکـرتن دا، تاکوو لە نێوان ئێمە و PDK ئاکۆکی و شەڕ دەرکەوێ. دیسان بەر لە شەڕ گروپێک هەڤاڵی بریندار کە دەمانەویست دەربازی گۆڕەپانی سەرۆکایەتیان بکەین، کاتی دەربازبوونیان لە زاخۆ، خستنیە کەمەرۆی .PDK. دەیهەویست بەهەر جۆرێک دەتوانێ ڕامانکێشێتە ئەو شەڕ و بەپێی بەرژەوەندی خۆی هەڵمان سوڕێنێ. بەوجۆرە ئێمە و PDK**

---

٥٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٧١

٥٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٧٢

بەرز کەن و بۆخۆی ببێتە فەرمانڕەوای سەرلەبەری کوردستان. گەلێ شەڕی ئێمە ڕوستا و نەگریسەمان کرد. YNK زۆری پێ ناخۆش بوو و دەیەویست ئەو شەڕە ئیمەن دەست پێبکەنەوە(٥٦).

پێشتر گوتم دەولەتی تورکیا بەهۆی سوتاندن و قەلاچۆ کردنی گوندەکانی سەر سنووری دەسکرد و گواستنەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە، پەیوەندی گەریلا و لایەنگرانی کوردی باکووری کوردستانی لێک پچڕاند و گەریلا نیتر وەک پێویست نەیتوانی خۆ بخزێنێتە ناو قولایی خاکی تورکیا و شەڕ بکات و تەنانەت لە شەڕی ناوچەکانی سەر سنووریشدا پتر زەبری لێ دەکەوێ تا بە دەست هێنانی دەسکەوت. لەبەر ئەوە پ.ک.ک بۆ بەهێزکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەلکی شار و گوندەکان و کوردی بەشەکانی تر، لە فکری دانانی تەلەفزیۆنێکی سەتەلایتدا بوو. ئیمکاناتی باشی ئابوری کە پەیداکردنەکەی گومان و مشتومڕی زۆری لەسەرە و زۆربوونی ژمارەی کوردی باکووری کوردستان لە ئەوروپا، بۆ وێنە نیو ملیون کەس لە ئالمانیا، ئەو دەرفەتەی بۆ پ.ک.ک ڕەخساند، کە بتوانێ لە کۆنفرانسی چوارەمیدا، بڕیاری دانانی کەناڵێکی تەلەفزیۆنی سەتەلایت بدات.

دامەزرانی تەلەفزیۆنی MED لە لایەن پ.ک.ک و هەنگاوێکی بەنرخ بوو لە خەباتی سیاسی و جەماوەری کورددا، کە پ.ک.ک لە تەکنیکی نوێی جیهاندا دەستی پێگەیشت. تەلەفزیۆنی MEDtv، یارمەتییەکی زۆری باری فەرهەنگی و زمانەوانی کوردەکانی باکووری کوردستان دا. پ.ک.ک لە بوارەکانی سیاسیشدا زۆر باش توانی ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە دەولەتی تورکیا لە نێوان گەریلا و ئەندامان و لایەنگرانیدا پێکی هێنا بوو. تەلەفزیۆنی MED بوو بە مینبەرێکی سیاسی، فەرهەنگی و ڕێکخستنی پ.ک.ک دژی دەولەتی تورکیا و ئەگەر تەنیا بۆ ئەو مەبەستە و بەرژەوەندی گشتیی کورد کەلکی لێ وەربگیرایە، بێگومان جێگەیەکی تایبەتی پەیدا دەکرد لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەی کورددا، بەلام ئەوەی نەکرد و لە پەنای خەباتی دژ بە تورکیایدا، زۆر ناشیرینانە دژی ڕێکخراوە کوردییەکان، ولاتانی ئەوروپا و بە تایبەتی دژی حکومەت و پەرلەمانی کوردستان کەلکی لێ وەرگیرا و لە هیچ شێوەیەک بۆ زەبر لێدان لە دەسکەوتە نەتەوەییەکانی کورد لە پارچە جیاوازەکانی کوردستاندا کۆتایی نەکرد و گەورەیی خۆی لە ڕیسوا کردنی سەرۆکە کوردەکاندا دەبینی.

---

٥٦- هەمان سەرچاوە لاپەڕەی ٦٧٢

گوێ نەدانی لێپرسراوانی پ.ک.ک بە یاساکانی جیهانی و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی لە سەر شاشەی MEDtv و هاندانی لاوانی کورد بۆ بەئەنجام گەیاندنی کاری دژ بە یاسا لە جیهاندا، وەک دەست بە سەرداگرتنی ساختمان و دەزگا سیاسی و فەرهەنگییەکان و سەفارەتخانەکان و هەڵگەڕانەوە لە پۆلیس، سەرەتا دەوڵەتی ئالمانیای ناچار کرد تا کۆتایی بە چالاکی سیاسی پ.ک.ک لە وڵاتەکەیدا بێنێ و لە دوایی دا وەڵاتانی ئەورووپی کرد بە دژ بە خۆی و کوردەکانی دانیشتووی ئەورووپا.

MEDtv بۆ دامەزراندنی ویستی پ.ک.ک بەسەر ڕێکخراوە کوردییەکاندا، بوو بە بڵندگۆی شەڕی کورد بەدەست کورد بە کوشتدان و هەڵی بۆ ژمارە کوردێکی بەناو ڕۆشنبیر ڕەخساند، تا بۆ هێمن کردنەوەی دەروونیان، ڕێبەر و ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکان تاوانبار بکەن و بەبێ لەبەرچاو گرتنی هیچ پرنسیپێک بە تاوانی ئەوەی کە نەیانتوانیوە شۆڕش سەر خەن، لە سەر شاشەی تەلەفزیۆنی MED محاکمەیان بکەن. دیارە لە کەش و هەوایەکی ئەوتۆشدا دوژمنانی ئازادی کورد و ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان هەوڵ دەدەن کەسانی گوێ لە مست و بەکرێگیراوی خۆیان بخزێننە ناو ئەم گێرە و کێشەیە، کە لەناو هێزە کوردییەکاندا سەرهەڵدەدات. لە ئاکامی ئەو هەڵەکارییانەدا، MEDtv ۲۱ جار لە لایەن خاوەن شەریکەی سەتەلایتەکەی هۆشیار کرایەوە و سەرئەنجام دوای گیرانی ئۆجەلان، ئیزنی بڵاوکردنەوەی لێ وەرگیرایەوە. پ.ک.ک توانی بە کەڵک وەرگرتن لە یاساکانی ڕاگەیاندنی گشتی ئەورووپا، تەلەفزیۆنێکی دیکە بە ناوی MEDYAوە بکاتەوە و ئەمجارە لەژێر چاودێری یاسادا پرۆگرامەکانی بڵاوبکاتەوە.

بەر لەوەی MEDtv دابخرێت ، پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان ڕۆژی ۱۹۹۸/۹/۱۷ لە واشنتۆن ڕێککەوتن و بەڕێزان مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی پەیمانێکی ئاشتییان مۆر کرد. پ.ک.ک دوابەدوای ئەو ڕێککەوتنە، ڕۆژی ۱۹۹۸/۱۰/۲۱، لە تەلەفزیۆنی MEDtv ڕایگەیاند: لایەنی سێیەمی ئەو ڕێککەوتنە پ.ک.ک یە و دەبێ لەبەر چاو بگیرێ، هەروەها گوتی: ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی لە تاران، ئەنکارا، دیمەشق، بەغدا و سەرچیاکانی کوردستان بڕیاری لەسەر دەدرێ. پ.ک.ک لە کۆتایی ۱۹۹۷ و سەرەتای ساڵی ۱۹۹۸دا بەهۆی لایەنگریی کردنی کوردی بەشە جیاوازەکانی کوردستان لەو، هێز و توانایەکی زۆری پەیدا کرد و گەلێک جار بەهۆی چالاکی خۆ

بەختکەرانە (ئینتحار)ی لایەنگرانی، بەرژەوەندەکانی تورکیا و تەنانەت ئەورووپاشی خستە مەترسییەوە. تورکیا لە بەرامبەر ئەو زەبر لێکەوتنانەیدا، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٨وە گوشارێکی زۆری خستە سەر و لە سەرەتای مانگی سێپتەمبەری ١٩٩٨دا، ئۆجەلانی ناچار کرد بە شێوەی یەک لایەنە دژی تورکیا شەڕ ڕاگرێ و داوای مافی کولتوری و ئازادبوونی هەڵسوڕانی سیاسی پ.ک.ک لە چوارچێوەی سنورەکانی تورکیادا بکات. تورکیا لە بەرامبەر داوای ئۆجەلان، بە یارمەتی دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەورووپا و ئەمریکا پلانێکی سەرتاسەری بۆ لەناو بردنی پ.ک.ک دارشت. تورکیا هێزەکانی گواستەوە لە سنوری سوریا و لەوێ مۆڵی دان و ڕایگەیاند: ئەگەر دەوڵەتی سوریا کۆتایی بە چالاکی و مانەوەی پ.ک.ک و ئۆجەلان لە سوریا نەهێنێ، ئەو هێرش دەکەنە سەر ئەو وڵاتە.

حافز ئەسەدی سەرۆک کۆماری سوریا هەڕەشەی تورکیای بە جیددی گرت و بۆ ئەوەی وڵاتەکەی تووشی شەڕ نەبێ، عەبدوڵڵا ئۆجەلانی ناچار کرد سوریا بەجێبهێڵێ. ئۆجەلان چونکە بە ژیانی پێشمەرگایەتی ڕانەهاتبوو، یان بڕوای بە ئەندامان و گریلاکانی نەبوو، نەیوێرا بچێتە چیاکانی کوردستان و لە سوریاوە چووە ڕوسیا. پەرلەمانی ڕوسیا داوای ڕاگرتنی ئۆجەلانی کرد، بەلام یەلتسین، سەرۆک کۆماری ڕوسیا لەسەر گوشاری ئەمریکا و ئەورووپا ئیزنی مانەوەی پێنەدا و ناوبراو ناچار بوو بچێتە ئیتالیا، کە ڕۆژی ١٩٩٨/١١/١٢ لە فڕۆکەخانەی ڕۆم دابەزی، پۆلیسی ئیتالیا دەستبەجێ خستییە ژێر چاودێرییەوە.

ئۆجەلان بۆ ئەوەی لەو کێشەیەی کە تووشی هاتبوو خۆی ڕزگار بکات، ڕۆژی ١٩٩٨/١١/٢٥ پێشنیارێکی نوێی حەوت خاڵیی ئاراستەی تورکیا کرد، بەلام وەڵامی نەدرایەوە و تەنانەت داوای لە ئیتالیاش کرد ئۆجەلانی بە تاوانی تێرۆری هاووڵاتیان تەسلیمی تورکیا بکاتەوە. ئیتالیا بە شێوەی ڕاستەوخۆ ئەو کارەی نەکرد، بەلام کە بینی مانەوەی ئۆجەلان لە ئیتالیا زەبر لە بەرژەوەندە سیاسی و ئابوورییەکانی دەدات، بە ئۆجەلانی قەبلاند کە ئیتالیا بەجێبهێڵێ. ئۆجەلان پەنای بۆ وڵاتی هۆڵەندا برد و لەوێش ڕانەگیرا، چووە یۆنان، کە چی دەرگای ئەوێشی لێ گالە درا و بە ڕێنوێنی یۆنانییەکان خۆی گەیاندە کینیا. ئۆجەلان ڕۆژی ١٩٩٩/٢/١٥، بە پلانێکی چەند لایەنی لە نایرۆبی پایتەختی کینیا گیرا و ڕفێنرایەوە تورکیا.

گیران و بردنەوەی ئۆجەلان بۆ تورکیا و زیندانی کردنی لە دوورگەی ئیمرالی، کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر وورەی نەتەوەی کوردمان و تەنانەت ئەوانەش کە

زەبریان لە لایەن پ.ک.ک وە خوارد بوو. بە کۆنگرەی سوننەتی کوردەواری بوی بە پەرۆش بوون و هەموو لایەک دژی تورکیا راپەڕین. ٦٣ کەس لە تورکیا و ئەوروپا، دژی بێدەنگ بوونی ئەوروپا و ئەمریکا لە ئاست کێشەی کورد، ئاگریان لە جەستەی خۆیان بەردا و چەندین چالاکیی خۆبەختکەرانە لە شارەکانی تورکیا ئەنجام درا.

پ.ک.ک دوای گیرانی ئۆجەلان، لە کۆتایی مانگی ئاداری ١٩٩٩دا کۆنگرەی شەشەمی خۆی پێکهێنا تا ستراتیژی خەبات و کۆمیتەی ناوەندیی نوێ هەلبژێرێ، بەلام سەرەک ئۆجەلان دەلێ:

**هەولی هەموو ئەو کەسانەم لەبار بردووە کە ویستیان ببن بە کەسایەتی دووەم لە پ.ک.ک دا(٥٧).** کەس نەیتوانی جێگەی ئۆجەلان بگرێتەوە و کۆنگرە بەبێ ئەوەی کە سەرنج بداتە باری رۆحی ئۆجەلان لە زیندانی ئیمرالی تورکیا. سەرلەنوێ ئۆجەلانی بە سەرۆکایەتی پ.ک.ک هەلبژاردەوە و رایانگەیاند مەسەلەی کورد لە ئیمرالی چارەسەر دەکرێ. کۆنگرە هەروەها کۆمیتەیەکی ناوەندی لە عوسمان ئۆجەلان، جەمیل بایک، دوران کالکان، مستەفا قەرەسێلان، سەکینە جانسز، مستەفا قەرەسو و پێنج کەسی تر پێکهێنا. کۆمیتەی ناوەندیی پ.ک.ک لە راگەیاندنی کۆتایی کۆنگرەی شەشەمیدا کە رۆژی ٣ی ئاداری ١٩٩٩ بلاوی کردووەتەوە، دەلێ:

کۆنگرەی شەشەمی پ.ک.ک سەرلەنوێ وەک کۆنگرەکانی پێشووی، ریبازی ئۆجەلانی بە ستراتیژی جیهانی بۆ [illegible] ەزرانی سۆسیالیزم ناساند و بە ناوی «ئاپۆیی» یان باشترە بلێیم «ئاپۆییزم»تاکتیکەکانی خەباتی دوارۆژی لەسەر دامەزراند. کۆمیتەی ناوەندی پ.ک.ک لە راگەیاندنی رۆژی ٣ی ئاداری ١٩٩٩یدا کە بە بۆنەی کۆتایی کۆنگرەی شەشەمییەوە بلاوی کردەوە، دەربارەی کەسایەتی ئۆجەلان و ستراتیژی دوا رۆژ بۆ دامەزراندنی سوسیالیزم دەلێ:

**کۆنگرەی ئێمە ئەم راستییەشی دەرخستووە کە سەرۆک ئاپۆ نوێنەرێکی هەرە هێژایە. سیمبۆلی سۆسیالیزم و رەمزی مرۆڤایەتیی سەردەمی ئێمەیە. لەم چوارچێوەیەدا، لە باری تیۆری و پراکتیکەوە، سەرۆکایەتیی ئێمە لە خەباتی شۆڕشگێری و سۆسیالیستیدا رۆلێکی مەزنی بە دەستەوەیە. دژی سیستەمی ئیمپریالی و کاپیتالی، رەنگی ژیانێکی نوێ و شێوە تێکۆشانێکی تازەی پێکهێناوە.**

**سەرۆک ئاپۆ کریستالیزەیەکی تەواو عەیاری خەباتی سۆسیالیستییە و لە هەر**

---

٥٧- سەرکردە و گەل ، حەوت رۆژ لەگەل ئاپۆ لاپەرەی ٢١٠.

هەلومەرج و باروودۆخێکی مێژووییدا ئەرکی سەرشانی بەجێبهێنەوە. پارتیی ئێمە لەسەر ڕۆح و تفکیری سەرۆک ئاپۆ دامەزراوە و هەر ئەو ڕێبازە پۆزەتیڤە درێژە پێدەدات کە ئەو دامەزرێنەری بووە. فەلسەفەی سەرۆک ئاپۆ هەر ئەو زانستەیە کە هەموو هێزە سۆسیالیستەکان و سەرجەمی ئازادیخوازان و ئاشتیخوازان و دیموکراتەکانی جیهان وەک سەرچاوەی تێکۆشان باوەڕیان پێیەتی.

نوێنەرانی کۆنگرەی شەشەمی پ.ک.ک بەبێ دەرس وەرگرتن لە شکستی شەڕەکانی ڕابردوویان کە دژ بە هێزە سیاسییە کوردییەکان و بە تایبەتی دژی پارتی دیموکراتی کوردستان و حکومەت و پەرلەمانی کوردستان بەڕێوەیان بردبوو، بڕیاریاندا لەمەودوا بەناوی پ.ک.ک ی باشوور لەو هەرێمەدا درێژە بە شەڕ بدەن و لە پەنای ئەویشدا شەڕ بردنە قوڵایی تورکیاوە. هەموو دەزانین کە پ.ک.ک بڕیاری خۆی بۆ بردنی شەڕ بۆ قوڵایی تورکیا بەجێ نەگەیاند و تەنانەت لولەی چەکەکانیشی شۆڕ کردەوە و ڕایانگەیاند هەرگیز دژی تورکیا دەست بۆ چەک نابەنەوە، بەلام دوا بە دوای کۆتایی هاتنی کۆنگرە، بە یارمەتی داگیرکەرانی کوردستان، گریلاکانی وەک گورگی برسی لە گیانی خەڵکی ئاسایی باشووری کوردستان بەردا. پ.ک.ک بۆ وەشاندنی زەبری گورجوبڕ لە گەلی کوردمان لە باشووری کوردستان، لە تاکتیکی شەڕی گەڕۆک کەلک وەردەگرێ و ڕۆژ نیە لەو هەرێمەدا ژمارەیەک بەدەست چەکدارەکانی زیانیان لێ نەکەوێ. کۆمیتەی ناوەندی پ.ک.ک لە ڕاگەیاندنی ڕۆژی ٢ی ئاداری ١٩٩٩یدا دەڵێ:

**· کۆنگرەی شەشەم ئەنالیزێکی قووڵ و بنەڕەتی و زیاتری لەسەر گریلا کردووە. لە باری شەڕ و ئەرتەشی ڕزگاریی کوردستان و پێش نەکەوتنێکی دیار و بەرچاوی ئەم ئۆرگانە، سستی و کزی و دەستی کەم گرتنی ڕۆڵ و دەوری گریلا وەک هۆ دەنرخێنێت و کەم کاریی بەڕێوەبەرەکان و گریلاکان دەستنیشان دەکات. بەپێی ئەو ئەسڵە کە تیپیلینی گریلا گەرانتی ژیانی ئێمەیە و هەر شتێکی ئێمە بریتییە لە سوپا و گریلا، کەوایە دەبێ ARGK هەردەم مەزنتر و بەهێزتر و کارامەتر بکرێت..... شەڕ بەرەو باشووری کوردستان و بۆ قوڵایی خاکی تورکیە بەرەو پێش بەرێت، ترس و دڵەخورپە بخاتە گیانی دوژمنەوە و بە شەڕێکی گەورە و گران سیستەمی کۆلۆنیالی لەبن و بناغەوە بلەرزێنێت.**

کۆنگرەی شەشەمی ئێمە، هەموو پارچەکانی کوردستان و سەرهەڵدانەکانیان لەبەر ڕۆشنایی ئەتەوەییدا دەنرخێنێت و بەتایبەت لەسەر باشووری کوردستان

ڕادەوەستێت و هەلومەرجێکی کە ئەوا ئیمڕۆ زاڵە بەسەر ئەم بەشەی نیشتمانەکەمان و بەتایبەت کە پڕۆبلیمات (گیروگرفت- نوسەر) و بێ نارامی و نەبوونی سەقام و پایەدارییەکی سیاسی تێدا بەرچاوە، هەوڵی پتر و خۆماندوو کردنێکی مەزنتری تێدا بە پێویست دەبینێت و دەبێ ڕادە و بارستایی ڕێکخراوەی سیاسیمانی تێدا بەهێزتر بکەین. لەسەر ئەم ئەساسە، بۆ ئەوەی خەتی پارتیمان لەم هەرێمەدا بتوانێ ژیانێکی گەرانتیدار وەرگرێت، بڕیارە هەموو خەباتی خۆمان لەو هەرێمەدا لەژێر ناوی (پ.ک.ک باشوور) بخەینە گەڕ و بەڕێوەی بەرین.

بەڵێ، کۆمیتەی ناوەندی پ.ک.ک لەژێر ناوی پ.ک.ک ی باشوور تا ئێستا ئەرکی خۆی دژی دانیشتوانی باشووری کوردستان بەڕێوە دەبات و گومانیش لەوەدا نیە، کە ترس و دڵەخورپەیەکی زۆری خستووەتە سەر خەڵک و تەنانەت بەزەییان بە چێڵ و مەڕ و ماڵات و کانی و ئاو و کارەبای دانیشتوانیشدا نایەت، بەڵام تۆ بڵێی بەو کارانەیان بتوانن سیستەمی کۆلۆنیالیستی لەبن و بناغەوە بلەرزێنن؟

کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک ئەمڕۆ لە جیاتی ئەوەی کە هەوڵی ئازادکردنی ئۆجەلان لە زیندانی تورکیا بدات، یاخود بۆ پاراستنی پریستیژی ڕێکخراوەکەیان و بەفیڕۆ نەدانی خوێنی هەزاران ئەندام و لایەنگر و خەڵکی بێ تاوانی کوردستانی ژێردەستی تورکیا، فەرمانەکانی ئۆجەلان وەپشت گوێ بخات و گوێ نەداتە ئەو فەرمایشتانەی کە عەبدوڵڵا ئۆجەلان بە ئامۆژگاری میتی تورکیا دەیانکات: بە چەشنی سالانی ١٩٧٣-١٩٧٨، کە بە پلانی میتی تورکیا، ئەندامی ڕێکخراوە ئۆپۆزیسیۆنەکانی تورکیای تیرۆر دەکرد، بووەتە توتی و گوتنەکانی ئۆجەلان لەسەر چارەنووسی گەلەکەمان دووپات دەکاتەوە! بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستییە پێویستە بزانین ئۆجەلان لە زیندانی ئیمرالییەوە چۆن لەسەر کێشەی کورد و بزووتنەوەکانی دەدوێ. بەڵام باشتر ئەوەیە سەرەتا ئاگاداری بەشێک لە وتووێژێکی «ئەحمەد زەکی ئۆکچویوغلو» سەرۆکی پێشووی لیژنەی پارێزەرەکانی ئۆجەلان بین، کە ڕۆژی ١٩٩٩/٦/٥ لەگەڵ شاهین بەکر سورەکلی لە بەشی کوردی ڕادیۆی SBSی ئوستراليا ئەنجامی داوە. ئۆکچویوغلو لە بەشێکی دا دەڵێ:

پرسیار : واتە ئەو شتانەی ئۆجەلان دەیویست بیڵێت ڕای ئێوەی لەسەر نەبوو؟

وەلام : یەکەم جار بەویشم گوت و بە هەڤاڵەکانی ئەویشم گوت، کە ئەم کێشەیە بەر لە هەموو شتێک کێشەی کوردە و لە دواییدا کێشەی پ.ک.ک و پاشان هی عەبدوڵڵا ئۆجەلانە. هەڤالانی بەم شێوەیە تەماشای کێشەکەیان نەدەکرد و گوتیان

ئەم کێشەیە ئەوەڵ هی عەبدوڵلا ئۆجەلانە و پاشان هی پ.ک.ک و لە دوا
کوردە. بۆیە لە سەرەتادا ڕێک نەکەوتین و هۆی خۆکێشانەوەکەشم ئەمە بوو
پرسیار : بەڕێز ئۆکچویوغلو، میدیای جیهانی دەڵێت کە ئۆجەلان زۆر شـ
و هەندێک لەو گوتنانە دژی پرینسیپی سالانی ڕابووردوی پ.ک.ک یە. ل
ترموە (پ.ک.ک)ش دەڵێت میدیای تورکی درۆ دەکات و ڕاست نالێ.
دەوترێت ئەو شتانەی ئۆجەلان لە دادگاکەدا دەڵێت نوێ نین و پێش ئێـ
گوتراون. بە دیتنی ئێوە ئۆجەلان لە دادگاکەدا چی گوت و بۆ ؟
وەلام  بێشانیش هەندێک چەوتی لە دیتنەکانی ئۆجەلان دا هەبوو
... چاوێن؛...

پرسیار : مەبەستت ڕای ئەو (عەبدوڵلا ئۆجەلان) لە دادگادایە یان شتی تر؟

وەلام : ئەو تێڕوانینانەی کە لەسەر ئۆجەلان دەنوسرێن، گوتراون و دەنوسرێن و ڕاستن. پەندێکی تورکی هەیە دەڵێت: «میزراک چووال سگماز» واتە (تیر کە ڕەها بوو لە کەوان دا نامێنێ) بۆیە ئێمە ناتوانین هەموو شتێک بشارینەوە، لەبەر ئەوەی هەموو ئاشکران. لەسەرەتادا بە عەبدوڵلا ئۆجەلانم گوت، دەوڵەت فریوت دەدات، پێت دەڵێت ئەگەر ئیفادەکەت (وەلام) وەها بێت و ئەم شتانە بڵێی، ئیعدامت ناکەین. بە ئۆجەلانم گوت هەر بەم شێوەیەش شێخ سەعیدیان فریو دا. ئەوان ئیعدامت دەکەن، بەلام ئەو باوەڕی بەمن نەکرد.

پرسیار : ئەم سیناریۆیەی کە ساز دەدرێت و شێوەی دادگایی کردنی ئۆجەلان، وەک پارێزەر و محامی بە دڵی تۆ نیە. باشە ئەگەر پرۆسەی پاراستنی ئۆجەلان لە دەست تۆدا بووایە و تۆ پارێزەری سەرەکی ئەم کێشەیە بوویتایەی، پرۆسەی پاراستنت بەچ شێوەیەک بەڕێوە دەبرد؟

وەلام: من بە عەبدوڵلا ئۆجەلانم گوت، تۆ دەبێ بەرگری لە خۆت بکەی و کێشەی کورد و ڕێکخستنەکەشت بپارێزی.

تۆ ناتوانی تازە ئەمڕۆ بەرەو دواوە هەنگاو هەلگری. بەلێ، زۆرتان هەڵە هەیە و من خۆشم دژی ئێوە بووم و ئێستاش دژی ئێوەم، بەلام دەوڵەتی تورکیاش هیچ ڕێگای تری لە بەرامبەر کورد نەهێشتبوو. بۆیە تۆ دەبێت ئەمە بڵێیت، هیچ ڕێگایەکتان پێشانی ئێمە نەدا و هیچ ڕێگایەکتان لە بەردەم ئێمە نەهێشت، بۆیە ئێمەش ناچار بووین چەک هەلگرین و چەکیش زیانی بە هەردوولا گەیاندووە. ئێمە خوازیاری ئەوە نین بە شێوازی چەکداریی درێژە بەم کێشەیە بدەین، بەلام دەبێت

بڕیار بدەن و ڕێگای تر بکەنەوە. پێم گوت مافی کورد بپارێزە، ئەوە سەد ساڵە تورک ئینکاری مافی کورد دەکات. تۆ دەبێت باسی کورد بکەیت و وەک سەرکردەیەک بەرگری لە خۆت بکەی و لەسەر پێی خۆت بوەستی، بەڵام ئەمتوانی قەناعەتی پێ بکەم.

پرسیار بەڕێز ئوکچونوغلو بینینتان بۆ ئەم ڕەوشە دیتنێکی بەخێر نیە وەک دەڵێن ؟

وەڵام: بەڵێ بەخێر نیە. کاتێ شێخ سەعیدیش هەر ئەم شتە بوو. شێخ سەعیدیشیان فریودا. چوونە ژوورەکەی (لە بەندیخانەی ئیمرالی) و پێیان گوت، مەلێ ئەم کێشەیە، کێشەی کوردانە و بڵێ ئێمە بۆ ئیسلام ڕاپەڕیوین. ئێمە بڕیاری ئیعدامت دەدەین و پاشان بۆت دەکەین بە زیندانی هەمیشەیی (دایم). دەتنێرین بۆ (ئەرنا) و دوو ساڵ دورت دەخەینەوە. دوای ئەو دوو ساڵە بچۆ (خنس) و لە ناوچەی خۆت بمێنەوە. ئێمە دێین پێکەوە بەرخێک سەر دەبڕین و دەیخۆین. ئا بەو شێوەیە ڕێک کەوتن. شێخ سەعید دەرواتە دادگا و وەک عەبدوڵلا ئوجەلان ئینکاری شتەکانی دەکات و ئینکاری کێشەی کورد دەکات و لە دوابیشدا بڕیاری لە سێدارەدانی دەدرێت و هەر ئەو ڕۆژە دەیبەن دەیکوژن. کاتێ دەیبەن بیکوژن، شێخ سەعید ئەو حاکمە دەبینێ کە ناوی حاکم (عەلی سایب) بوو. پێی دەڵێت، عەلی بەگ تۆ گوتت ئەوها و ئەوها بڵێ ئێمە عەفوت دەکەین. حاکم دەڵێت ئەم سزایە بۆ کەسانی وەک تۆ کەمیشە و شێخ سەعید دەبەن و لە سێدارەی دەدەن.

ئەم چیرۆکەی شێخ سەعیدم لە لای کوێنرا گریلاکانی تورک بۆ ئوجەلان گێڕایەوە و پێم گوت شێخ سەعیدیان ئاوا بەمجۆرە فریودا و توش فریو دەدەن. ئوجەلان گوتی پەیوەندی من و شێخ سەعید هیچ بەیەکەوە نیە.

پرسیار هەر بەم شێوەیە ئوجەلان وەڵامی دایەوە؟

وەڵام بەڵێ. جاری دووەم کە من چوومە لای، ئوجەلان بەمنی گوت: ئەوانەی لە ژوورەوەن خۆشییان لەو چیرۆکەی تۆ دەربارەی شێخ سەعید نەهات. دەبێ لەمەودوا وریا بی لە قسەکانندا و شتی ئاوا جەوت بەمن نەڵیی. پێم گوت ڕاستییەکەی ئەوەیە. من بۆ ئەوەم نەگوتووە کە ئەوان کەیفیان پێ بێت. حەزم دەکرد ئەمە نمونەیەک بێت بۆ تۆ و دەرسی لێ وەرگری.

پرسیار : ئیشکچییەکانی تورک قسەکانی تۆیان بیست؟ تۆ بە ئاشکرا ئەو شتانەت گوت؟

وەلام : بەڵێ، ئەزێنکی مێژوویی یە، پێویستە یان دەستی پێ نەکەین، یان کاتێک کەوتینە ناوی ئەرکی خۆمان جێبەجێ بکەین. من ناچار بووم ئەو ڕاستییە بڵێم. ئێستا کە ئاگاداری بیروڕای «ئەحمەد زەکی ئۆکچویوغلو» سەرۆکی پێشووی لیژنەی پارێزەرەکانی ئۆجەلان و ڕێکخراوەکەی بووین باشترە سەرنج بدەینە بەشێکی بچووکی وتەکانی ئۆجەلان و بزانین ئەو چۆن و بە چ شێوەیەک لە بەرامبەر دادگای تورکیادا بەرگری لە ئایدیۆلۆژییەکەی و پ.ک.ک و نەتەوەی کورد دەکات. بۆ ئەم مەبەستە لاپەڕەی ٢ ڕۆژنامەی ڕۆژە تەزا (Roja teze) ژمارە ٢ دەکەینەوە، کە بەشێک لە وتەکانی ئۆجەلانی بڵاو کردووەتەوە. ئۆجەلان لە دادگادا گوتی:

**- بۆ ئاشتی و دیموکراتی هەلێک بە من بدەن تا کۆتایی بە شەڕی پ.ک.ک بێنم. خەلک لەسەر چیاکانەوە بێنمەوە خوارێ و نەهێڵم چیتر خوێن بڕژێ. من دوای بیست ساڵ تازە تێگەیشتم کە ڕێگای شەڕ هەڵەیە. کاروباری سیاسی ئاشتیخواز و دیموکرات باشترە. ...من سەربەخۆییم ناوێ، تەنانەت فیدراسیۆن و خودموختاریشم ناوێ. ئەو ویستانە لەجێیدا نین و دەوڵەتی تێکەلاو باشترە. من تەنیا کۆماری دیموکراتیم دەوێ. من دەمەوێ خزمەتی دەوڵەتی تورک بکەم. من ئەگەر هەتا ئێستا گەلێک هەڵەم کردووە، دەمەوێ لەمەویاش هەڵەکانم ڕاست بکەمەوە. ئێوە چیتان دەوێ من وا دەکەم..... سەرهەڵدانی پێشووی کوردان وەک سەرهەڵدانی شێخ سەعید، دێرسیم و ئەوانی تر هەموویان کۆنەپەرستانە بوون، فیۆدالی بوون، دژی کۆماری تورکیا بوون، لەبەر ئەوە مستەفا کەمال بە شکاندنی ئەوان کارێکی باش و بە نرخی کرد. پێویست بوو ئەوە بکات. کەمالیزم ئایدیۆلۆژییەکی باشە و من لەگەڵ ئەوەم. ... ئەو پیلانەی باکووری عێراق مەترسییەکی گەورەی بۆ تورکیا هەیە، کە بە دەستی ئنگلیز پێکدێ. من دژی ئەوەم. من دەمەوێ موسڵ و کەرکووکیش بکەونە ناو سنوری تورکیا، تا میساقی نەتەوەیی تەکمیل بێ.**

ئەمانە تەنیا بەشێکی بچووکی وتەکانی ئۆجەلانن کە لە بەرگرییەکەیدا بۆ دادگای تورکیای نوسیوە و کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک ش لە بەیاننامەیەکدا ڕایگەیاند: ئێمە لەگەڵ سەرۆکایەتین و ئەو چ دەڵێ لەجێیدایە. بەمجۆرە کۆماری دیموکراتی بوو بە بڕیاری پ.ک.ک و ستراتیژی لەسەر دارێژرا.

# کۆماری دیموکراتی

پارتی کرێکارانی کوردستان سێ قۆناغی خەباتی بڕی تا پڕۆژەی کۆماری دیموکراتی کردە ستراتیژ و وازی لە سەربەخۆیی و فیدرالی کوردستان هێنا. پ.ک.ک ئەمڕۆ بە ڕێگای کۆماری دیموکراتییەوە پەیمانی وەفاداریی خۆی بە دەوڵەتی تورکیا ڕادەگەیەنێ و بە وتەی ڕێبەرانی، خەریکە میساقی نەتەوەیی لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیا تەکمیل بکات، ئەویش بە شێوەی یەک لایەنە و نەک بە ڕازی بوونی دەوڵەتی تورکیا.

قۆناغی یەکەمی ژیانی پ.ک.ک لە ١٩٧٣وە دەستی پێکرد و هەتا ساڵی ١٩٧٨، کە کۆنگرەی دامەزراندنی بوو، دەوامی کرد. پ.ک.ک لەو قۆناغەیدا گرووپێکی ئایدیۆلۆژی بچووک بوو، بەپێی نوسینی ئۆجەلان و هەڤاڵ جومعە (جەمیل بایک)، گرووپەکەیان بە ئیمکاناتی دەوڵەتی تورکیا خۆی پەروەردە کرد.

قۆناغی دووەمی پ.ک.ک لە کۆنگرەی دامەزراندنییەوە هەتا ١٤ی ئابی ١٩٨٤ دەگرێتەوە. پ.ک.ک لەو قۆناغەیدا گریلاکانی لە «دۆڵی بەقاع» بارهێنا و لە سوریا، ئێران و باشووری کوردستاندا خۆی حەواندەوە.

قۆناغی سێیەمی ژیانی پ.ک.ک، لە ١٥ی ئابی ١٩٨٤وە دەست پێدەکات و هەتا ١٥ی ئابی ١٩٩٩، ماوەی ١٥ ساڵ شەڕی چەکدارانەی ئەو ڕێکخراوە لەخۆ دەگرێ.

پ.ک.ک ئەمڕۆ بە ڕاگەیاندنی ستراتیژی کۆماری دیموکراتی پێی نایە چوارەمین قۆناغی ژیانی سیاسی خۆیەوە. ئەم هەڵوێستە نوێیەی پ.ک.ک وەرچەرخانێکی گرنگە لە ستراتیژی و تاکتیکەکانی ئەو ڕێکخراوەدا، بۆیە پێویستە سەرەتا بزانین پڕۆژەی ئەم ستراتیژییە لە کوێوە هات و چۆن سەری هەڵدا.

هەموو لایەکمان ئاگادارین، عەبدوڵڵا ئۆجەلان سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان ڕۆژی ١٥/ ٢/ ١٩٩٩ لە ئایرۆپی پایتەختی کینیا گیرا و بردیانەوە

تورکیا. دوابەدوای گیرانی ئۆجەلان دەیان پارێزەری کورد و بیانی ڕایانگەیاند، ئامادەن لە بەرامبەر دادگای تورکیادا، پارێزگاری لە سەرۆکی پ.ک.ک بکەن. دادگای ئاسایشی تورکیا چەند کەسێکی قەبووڵ کرد و «ئەحمەد زەکی ئۆکچوئوغلو» بوو بە سەرۆکی لیژنەی پارێزەرانی ئۆجەلان. ئۆکچوئوغلو بۆ ئەوەی لە لایەک کێشەی کورد بکێشێتە بەرنامەی کاری دادگای تورکیاوە و لە لایەکی ترەوە ئۆجەلان ڕزگار بکات، بە ناوبراوی گوت: « تۆ نابێ فریوی دەوڵەتی تورکیا بخۆی و پێویستە مافی کورد بپارێزی. سەد ساڵە تورک نینکاری مافی کورد دەکات و تۆ دەبێت باسی کورد بکەیت و وەک سەرکردەیەکیش خۆت بپارێزی و لە سەرپێی خۆت ڕاوەستی.» بەڵام ئۆکچوئوغلو نەیتوانی قەناعەتی پێ بێنێ.

ئۆجەلان ئامۆژگارییەکانی ئۆکچوئوغلوی لە گوێ نەگرت و بەپێی پیلانی کاربەدەستانی میتی تورکیا کە بە شێوە و تاکتیکی جۆراوجۆر هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن، لە دورگەی ئیمرالی تورکیاوە پرۆژەی کۆماری دیموکراتی گەڵاڵە کرد و کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک ش ئەوی بە ستراتیژی نوێی پ.ک.ک ناساند و هەتا ئێستاش بەبێ ئەوەی کە بە ڕاشکاوی بە خەڵک ڕابگەیەنن لە ستراتیژی پێشوویاندا شکستیان خواردووە، دیاردەی ئاشتی خۆیان لەگەڵ تورکان کردووەتە بنێشتەخۆشکە و لە ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکاندا پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن.

بەرلەوەی کە پەنجە بۆ ئامانجەکانی کۆماری دیموکراتی پ.ک.ک ڕاکێشم، پێویستە ئاوڕێک لەو بڕیارەی کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک بدەینەوە و بزانین ئەو کۆنسەیە لەسەر چ بنەمایەک و بەپێی کام بەند و مادەی پرۆگرامی پەسەندکراوی کۆنگرەی شەشەمیان، کە بڕیاری دابوو، شەڕی چەکداریی بەرێتە قووڵایی تورکیاوە، پشتی لەو بڕیارەی کۆنگرەکەی کرد و دوای تێپەڕبوونی سێ مانگ و بانگەوازی ئۆجەلان، شتێکیان لە جێ دانا، کە ۱۸۰ پلە جیاوازی لەگەڵ بڕیاری کۆنگرەکەیان هەیە. کۆنگرەی شەش بە بەشداریی ۳۰۰ کەس پێکهات و ستراتیژی و تاکتیکەکانی دوا ڕۆژی پ.ک.ک ی پەسەند کرد، بەڵام ئۆجەلان بە تەنها لە دورگەی ئیمرالییەوە هەموو ڕیسەکەی لێ کردنەوە بە خوری.

ئەو کۆمارە دیموکراتییەی کە پ.ک.ک ئەمڕۆ بە ستراتیژیی خۆی هەڵبژاردووە، بۆ زۆربەی هەرە زۆری گەلی ئێمە و تەنانەت لایەنگرەکانی پ.ک.ک ش دیاردەیەکی نارۆون و بێگانەیە و هەرکەسە بەجۆرێک لەسەری دەدوێ و لێپرسراوەکانی پ.ک.ک ش وەک پێویست ناتوانن مەبەستی ڕوونی خۆیان لە کۆماری دیموکراتی بۆ خەڵک

ڕوون بکەنەوە و لە ڕاستیدا باس لێکردنی ئەوەندە دژوارە، کە زمان توانای بەیانی نیە. بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکی ئەو ستراتیژییە نوێیەی پ.ک.ک بگەین باشترە سەرەتا بزانین ئۆجەلان لە بەرگریکردنە دەستنووسەکەی خۆیدا بۆ دادگای تورکیا چۆن ئاماژە بەو دیاردەیە دەکات و لە کۆماری دیموکراتی تورکیادا چ مافێکی بۆ کورد دەوێ. ئۆجەلان لە نامەیەکدا بۆ سەرۆکی دادگای ئاسایشی دەوڵەتی تورکیا دەنووسێ:

دادوەرە بەڕێزەکان، من دەمەوێ لەو ڕۆژانەدا کە محاکەمەی من نزیک دەبێتەوە، بەحەد بۆ چەند تەوەرەیەک ڕابکێشم کە بە محاکەمەی من دەبەسترێنەوە. کێشەی من و هەڵوەرجی ئەمڕۆی تورکیا. ساڵی ١٩٢٥ و کاتی دامەزرانی کۆماری تورکیا و لیبرال بوونی ئەو کۆمارە و کێشەی موسڵ و کەرکووکم وسیر دێتەوە، کە بەهۆی سەربزێوی ئەنجامێکی نیگەتیڤی بەدەست هات. بە تایبەتی فێڵبازی و پیلانگێڕی ئینگلیز کە لە پشت پەردەی کێشەی کورددا پەیدای کرد و ئەوی بە ئەنجام گەیاند.

ئێستا ئەو شتەی کە لە عێراق پێکدێ و بەستراوەیی ئەو بە کێشەی کورد، بارییەکەی ئەو سەردەمە لە مێشکدا زیندوو دەکەمەوە. ئەگەر من و پ.ک.ک لە جێی بڕیاڵی ١٩٢٥ دەبین، دەمەوێ بارییەکەی ئەمڕۆ گەلێک نزیکبەندی هاوبەشییان لەگەڵ بارییەکەی ئەوکات هەیە. من ئەو نووسا و ئەزمەزەی خۆم لەسەر پ.ک.ک و کوردان، بۆ ئەوەی کە ئەو بڕیارە دووبارە نەبێتەوە. مەبەستی مێژووی تورکیا بە برایەتی تورک و کورد گەلێک گرنگ دەبینم. بەکێشی و دیموکراتی ڕاستەقینە بۆ سەرکەوتنی کۆماری دیموکراتی لە بەرامبەر پیلانەکانی دەرەوە و بەتایبەتی لە دژی ئەو پیلانەی کە لە عێراق پێکدێ. بۆ سەرکەوتنی هێزی مەعنەوی میللی بە ئەرکی خۆمی دەزانم و بە هەڵوێستی نوێ خەرەکەی بۆ دەکەم(١).

ئۆجەلان بۆ پێکهێنانی بەیمانی نوێی هاوبەشی و پ.ک.ک لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا، لەچەند بەشێکی نامەیەکی ڕۆژی ١٩٩٩/٨/١دا بە کۆمسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک فەرمان دەدات و دەنووسێ:

پ.ک.ک دەبێ لێرەوبەدوا دەست لە هەندێ بیرێکی توندڕەوانەی خۆی و ئەو بەرنامەوچوونە کۆنەپەرستانە هەڵگرێ.

ئەگەر بەوردی لە بیری پ.ک.ک بڕوانین ئەوە دەردەکەوێ کە پ.ک.ک هیچ

---

١- ڕاپۆرتی دەستنووسی عەبدوڵڵا ئۆجەلان بۆ سەرۆکی دادگای ئاسایشی دەوڵەتی تورکیا لە ڕەهەندی ئیمراڵی، لە کتێبی: (Imralının perde arkası) لە پشت پەردەی ئیمراڵی، نووسینی ئۆیا ئارەوجۆو و لامعە ئایهان، بڵاوکراوەی ئومێد، ١٩٩٩ ئەنکارا.

جارێک دوای دەوڵەتی سەربەخۆ و جوودابوونەوەی لە کۆماری تورکیا نەکردووە و نەکەوتۆتە نێو قالبێکی ناسیۆنالیستی تەسکەوە.

بۆ گەورەیی دەوڵەت و سوپا، تورکیا دەیویست مەشروعیەتی سنورەکانی خۆی بپارێزێت. یا ئەوەتا دەبوایە پ.ک.ک ی لە سنورەکانی خۆیدا دوور خستبایەوە یان لەناوی بردبا. بۆیە دەبێت بچینە ئەو ناوچانەی کە لەپێشدا دەستنیشان کراون. دەبێ لەژێر سێبەری (UN) کەمپی مەخمور بکەین بە شوێنێکی سیاسی.

. دەبێ پ.ک.ک ی باشوور جێی خۆی لەنێو ئەو ڕێکخستنە نوێیەی کورد لە باشووری کوردستان بکاتەوە و سەرکردایەتیش هاوکاری ئەم شتە بکات بۆ ئەوەی جێگای خۆی وەک هێزێک لە دەسەڵاتی ئەوێ وەربگرێت.

تورکیا و هەندێ لایەنی تر توانیان پ.ک.ک وەک ڕێکخستنێکی تیرۆریست پێشانی وڵاتانی دەرەوە بدەن، هەر لەبەر ئەوە ڕێگا لە پ.ک.ک گیرا و نەیتوانی هەنگاو بەرەوپێشەوە بنێت.

پێویستە لەم قۆناغەدا خاڵە لاوازەکانی تورکیا دژی تورکیا بەکار نەهێنین، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێویستە بەهەموو توانایەکمانەوە هەوڵی بەهێزکردنی ئەو خاڵە لاوازانە بدەین.

ئەگەر دەوڵەتی تورکیا بەرامبەر بەو کارە باشانەی ئێمە هیچ هەڵوێستێکی پۆزەتیفی پێشان نەدا، ئەوە نابێ ئێمە بێ ئومێد بین.

- ئەم شتانەی کە من لەم قۆناغەدا دەیانڵێم پێویستە بە هەموو پ.ک.ک بگات، باوەڕ ناکەم زۆر کەس هەبن کە بەشێوەیەکی عەمدی دژی ئەم شتانە دەرکەون یان پێی ئیستفزاز (بەهەژێن) بن. ئەگەر واش بن ئەوە ئێوە بە ئاسانی دەتوانن دەمکوتیان بکەن. ئەوەی لەم بوارەشدا بکەوێتە سەرشانی من ئەوە منیش دەتوانم ڕۆڵی خۆم ببینم. لەلایەکی تریشەوە ڕاگەیاندنێکی بەهێزتان هەیە و ئەرکی سەرشانی ئێوەیە کە ئەم شتانەی من دەیانڵێم بە خەڵکی ڕابگەیەنن و ئەمەش ئەرکێکی زەحمەت نابێت.

- هەڵەیەکی گەورەیە گەر ئێوە وەکو پێشوو خۆتان لەوێ (کوردستانی باشوور) بە مەترسیەکی گەورە بۆ تورکیا ببینن.

- ئێوە خۆتان لە کوردستانی باشوور بە بێگانە دامەنێن، بەڵکو پێویستە خۆتان وەک خاوەن ماڵ ببینن چونکە نیوەی زیاتری ئەو ڕێکخستنە (پ.ک.ک باشوور) خەڵکی باشووری کوردستانە، بۆیە هیچ گرفتێکتان نابێت(٢).

---

٢- نامەی ئۆجەلانی بۆ کۆنسەی سەرکردایەتی پ.ک.ک، ڕۆژنامەی سەرخۆبوون، ژمارە ٢١٢، مانگی هەشت.

ئۆجەلان هەروەها ڕۆژی ١٩٩٩/٨/٢ بە هۆی پارێزەرەکانیەوە بانگەوازێکی ئاشتی بڵاوکردەوە. ناوبراو لە بانگەوازەکەیدا بە گریلاکانی ڕاگەیاند، دەست لە چەک بەردەن و دژی تورکیا شەڕ ڕاگرن، بۆ ئەوەی زەمینە لە برایەتی کورد و تورک نەکەوێ، سنوورەکانی تورکیا بەجێبهێڵن. ناوبراو هەروەها لە بەرامبەر نافەرمانی و سەربزێوییەکانی پ.ک.ک دا، داوای لە دەوڵەتی تورکیا کرد، لێبوردنی گشتی بۆ ئەندامانی پ.ک.ک دەر بکات و بە شێوەی ڕەسمی یاسای لێبوردنی گشتی ڕابگەیەنێ. کەچی بلەند ئەجەوید لە وەڵامی داوای ئۆجەلاندا ڕۆژی ١٩٩٩/٩/٤ گوتی:

**پ.ک.ک کەوتووەتە هەڵوێستێکی دژوارەوە، بۆیە ئەو بانگەوازەی ڕاگەیاندوە و دەیانەوێ بە مەبەستی دواییهێنان بە تیرۆر یاسای لێبوردنی گشتی پەسەند بکەین. هەرکەسێک بیر لە بەرژەوەندی تورکیا بکاتەوە، دەبێ لە کۆتایی هێنانی تیرۆردا یارمەتی بکات. بەڵام لە هیچ کاتێکدا ئەو مەسەلەیە ناخەینە سەوداو مامەڵەوە. ئێمە بە جێگەی لێبوردنی گشتی، داوای پەشیمانی قەبووڵ دەکەین، ئەویش لەو کەسانە کە تیرۆریان نەکردبێ و دەستیان بەخوێنی هاووڵاتیان سوور نەبووبێت.**

جیا لەوە سلێمان دمیرێلیش ڕایگەیاند:

**دەوڵەت ئەوجۆرە لێدوانانەی ئۆجەلان بە هیچ ناگرێ و گوتنەکانیشی کار لە ئێمە و دەوڵەت ناکات.**

مێژووی گەلانی ژێردەست و مێژووی پڕ لە کارەساتی گەلی کوردمان سەلماندوویانە، کە ئەگەر زیندانییەکی سیاسی خۆی بۆ ڕانەگیرێ و لە زینداندا بشکێ، بۆ ڕازی کردنی دوژمن و پاراستنی گیانی، گەلێک شتی ناڕەوای دوور لە ڕاستی دەڵێ. ئۆجەلان یەک لەو کەسانەیە کە پێشتر لە ساڵی ١٩٧٣دا حەوت مانگ زیندانی بووە و چونکە مانەوەی لە زینداندا زۆر بۆ دژوار بووە، دوای ئازادبوونی ڕایگەیاند: **"تازە قەت خۆم بەدەستەوە نادەم"**. کاتێ ئەمجارەش گیرا، ڕۆژی یەکەمی گیرانەکەی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆندا کە هەموو دانیشتوانی جیهان بینیان بە ڕاشکاوی بە پاسەوانەکانی ڕاگەیاند: **"من بۆ خزمەت ئامادەم"**. کەوابوو گوتنی زیندانییەکی وەک ئۆجەلان، کە بە نووسینی خۆی لە ساڵی ١٩٦٦وە بۆ ماوەی دوازدە ساڵان جیرەخۆری میتی تورکیا بووە، زۆر جێگەی سەرسوڕمان و ڕەخنە نیە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج و سەرسوڕمانە و گرنگایەتی هەیە، بڕیاری کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک یە، کە قسەکانی ئۆجەلان بەجیدی دەگرێ و پەیڕەوی لە

فەرمانەکانی دەکات، لەمەش سەیرتر پڕوپاگەندەی ئەو ڕۆشنبیرە تاریک بینانەیە، کە دەیانەوێ بە سەفسەتە و چەنەوەڕی، تەسلیم بوون بە ڕێباز و ستراتیژی نوێ دابنێن. بەڵێ، ئۆجەلان و کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک بە پەسەندکردنی ستراتیژی کۆماری دیموکراتی، هەموو شەرت و مەرجەکانی پێشوویان خستە ژێر پێ. سەرەتا هەموو شۆڕش و بزووتنەوە کوردییەکانی دوای ۱۹۲۵یان لە خزمەت بێگانەدا بینی و ئەوانیان بە کۆنەپەرەست، فیوداڵی و پێشگری دیموکراسی تاوانبار کرد. شێخ سەعید پیران، سەید ڕەزای دێرسیم، ئیحسان نوری پاشا و هەموو شەهیدانی ناو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردستان بە گوتنی ئۆجەلان و پ.ک.ک بە کردەوە نەیانهێشتووە کۆماری لیبراڵی تورکیا لە ۷۵ ساڵی ڕابردوودا ڕەوتی سروشتی خۆی بپێوێ و بە ئامانجە دیموکراتییەکانی بگات.

مێژووی پ.ک.ک لەسەر شەڕ و خوێن ڕشتن بینا کراوە، هەموو لایەک دەزانن، کە ئەگەر کەسێک ڕەخنەی لە ئاکار و کردەوەکانی پ.ک.ک گرتبا و شەڕی براکوژی پ.ک.ک ی سەرکۆنە کردبا، بە هاوکاری کەمالیزم و سەهیونیزم تاوانباری دەکرد!! ئێستاش شۆڕشەکانی کورد لە کوردستانی ژێردەستی تورکیا بەوە تاوانبار دەکات کە دژی کۆماری لیبراڵی کەمالیستەکانن!!!

ئۆجەلان و پ.ک.ک بۆ ئەوەی ئەرکی شۆڕشگێڕی خۆیان لە بەرامبەر کۆماری دیموکراتی تورکیادا بەجێ بگەیەنن، چەند قۆناغیان دەستنیشان کرد، وەک ئاگربەس، داماڵینی چەکی گریلا و دەست بۆ چەک نەبردنەوە، داوای لێبووردنی گشتی و گەڕانەوەی ئەندامان بۆ خزمەت کۆماری تورکیا.

چەک دانانی پ.ک.ک و کۆتایی هێنانی شەڕ بە دژی تورکیا، لە چوارچێوەی بڕۆگرام و پرنسیپی ڕێبەرانی ئێستایدا، بێگومان ئەو قازانجەی بۆ کورد دەبێ کە ئیتر تورکیا نەتوانێ گوندەکانی کوردستان وێران بکات و لاوەکانمان بە تاوانی کردەوەی تیرۆریستی بکوژرێ و بەپێی یاسامەندییەکانی ئەمڕۆی جیهان، مافە دیموکراتییەکانی کورد پێشێل بکات. هەروەها پ.ک.ک ش ئیتر ناتوانێ وەک پێشوو بیانوو بە کوردی باشووری کوردستان و بەشەکانی دیکە بگرێ و لەژێر پەردەی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان، چارەنووسیان لە مەترسی هاوێژێ. پتەوکردنی میساقی میللی ئەو لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا، پتر بیلانەکانی ئۆجەلان و پ.ک.ک ی ئاشکرا کرد، هەرچەندە عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە ڕابووردوشدا نەیدەشاردەوە و ئازادبوونی باشووری کوردستانی بە خەنجەرێک لە پشتی خۆی و ڕێکخراوەکەیدا دەبینی، بەڵام ژمارەیەک لە ڕووی نەزانی یاخود بە

مەبەستی تایبەتی و قازانجی شەخسی گوێی خۆیان لێ کپ دەکرد.
دوای بلاوبوونەوەی بانگەوازی ئۆجەلان، هەرکام لە ئەندامانی کۆنسەی سەرۆکایەتی و ئۆرگانەکانی پ.ک.ک بە تەلەفۆن و بەیانی رۆژنامەوانی پشتی بانگەوازی ئۆجەلانیان گرت و ئەویان بە ستراتیژی نوێی کورد ناساند. کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک لە بەیاننامەیەکی رۆژی ١٩٩٩/٨/٥یدا کە لە MEDYAtv خوێنرایەوە، پشتی بانگەوازی ئۆجەلانی گرت و رایگەیاند: هەموو شێوەکانی خەبات لە شێوازی کۆماری دیموکراتیدا بەڕێوە دەبات. کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک بانگەوازی ئۆجەلانی بە هەلێکی زێڕین بۆ تورکیا نرخاند. کۆمیتەی ناوەندی پ.ک.ک لە ڕاگەیاندراوێکی خۆیدا کە ڕۆژی ١٩٩٩/٨/٨ لە MEDYAtv بلاوی کردەوە، رایگەیاند: لە کۆبوونەوەی ڕۆژانی ٢٣-١٩٩٩/٧/٢٩دا، بانگەوازی ئۆجەلانمان بە ستراتیژی نوێ قەبووڵ کرد و پێویستە کێشەکەمان لەگەڵ تورک لە کۆمارێکی دیموکراتیدا چارەسەر بکەین و بۆ ئەوەش ئالوگۆڕ لە پەیڕەو پرۆگرامەکەماندا پێک بێنین، بڕیارماندا کۆنگرەیەکی نائاسایی ببەستین. بەرەی ڕزگاری نەتەوەیی (ئەرگەکە) ڕایگەیاند: لە ڕۆژی ١٩٩٩/٩/١ەوە سنورەکانی تورکیا بەجێ دێڵێ و دەکشێتەوە دەرەوەی سنورەکان. عوسمان ئۆجەلانی برای عەبدوڵلا ئۆجەلان، کە ئەندامی کۆنسەی سەرۆکایەتی پ.ک.ک یە، ڕۆژی ١٩٩٩/٨/٥ بە ڕێگای تەلەفزیۆنەکەیاند، کۆماری دیموکراتی بۆ ئێران، عێراق و سوریاش دەوێ. ناوبراو لەم بارەیەوە گوتی:

**- ئەو پرۆسە ئاشتییەی کە پ.ک.ک دەستی پێکردووە، بە پەلە بەرەوپێشەوە دەچێ و هیچ گیروگرفتیش لە پێکهاتنیدا نیە. پێویستییەکانی دیموکراسی و ئاشتی هەندە گرنگن کە ڕێگای گەڕانەوەیان نەماوە و ئێمە لەو هەڵوێستەماندا هەموو کۆمەڵگای تورکیا و دەوڵەتیشمان لەبەرچاو گرتووە. دەوڵەتی تورکیا باوەڕی بەم پرۆسەیە هەیە، بەڵام بە تەدبیر هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات. ئەو بڕیارەی ئێمە هەموو خەڵکی سەرسام کرد، بەڵام ئەمە ڕێبازی ئێمەیە بەرەو ئاشتی و دیموکراسی. هێزەکانمان بۆ ئاوەدان کردنەوەی تورکیا تەرخان دەکەین و ئەگەر هەلومەرجیش بێتە پێشەوە، ئێمە دەست بۆ چەک نابەینەوە و بەرپرسانی سەربازیی تورکیا دڵنیا دەکەین لەو بڕیارەمان پاشگەز نابینەوە. پرۆژەی کۆماری دیموکراتی بۆ هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و هەموو لایەکیش ڕۆڵی خۆیانی تێدا دەبینن و کۆماری دیموکراتیمان بۆ ئێران، عێراق و سوریاش دەوێ.**

هەتا ئێستا بە باوەڕی عەبدوڵلا ئۆجەلان و پ.ک.ک، دامەزرانی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد لە کوردستان بە سەرۆکایەتی ئۆجەلان و پ.ک.ک ئەرکی

بەرشانی هەموو کوردێک بوو، خزمەت لەم ڕێگەیەوە بە کورد بکات، بەڵام ئێستا فەلسەفەی عوسمان ئۆجەلان کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا پێویستە بە ئەرکی خۆیانی بزانن، کە لەژێر ڕێبەرایەتی پ.ک.ک دا تەسلیم بە ڕژێمەکانی ئێران، عێراق، سوریا و تورکیا ببنەوە و خزمەتی کۆماری دیموکراتی خۆیان بکەن.

جیا لەوانە، مستەفا قەرەسوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پ.ک.ک ش ڕۆژی ۱۹۹۹/۸/۸ بە تەلەفۆن بەشداریی پرۆگرامێکی تەلەفزیۆنی میدیای کرد و گوتی: لە ڕۆژی ۱۹۹۹/۹/۱ەوە ئاگربەس لەگەڵ پارتی دیموکراتیش ڕادەگەیەنین و ئەگەر ئەوان بگەڕێنەوە سەر هێڵی نەتەوەیی، دژی ئەوانیش شەڕ ناکەین.

بە قسەی مستەفا قەرەسوو وادیارە دەوڵەتی تورکیا گەڕاوەتەوە سەر هێڵی نەتەوەیی بۆیە پ.ک.ک، شەڕی دژی دەوڵەتی تورکیا ڕاگرتووە و بۆ هەمیشە وازی لە شەڕ دژی تورکیا هێناوە!!

بەمجۆرە هەرکام لە ئەندامانی کۆنسەی سەرۆکایەتی، کۆمیتەی ناوەندی و ئۆرگانەکانی پ.ک.ک بە نۆرەی خۆیان پشتی بانگەوازی ئۆجەلانیان گرت و بۆ ئەوەی میساقی میللی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا بەهێز بکەن، شەڕیان دژی تورکیا ڕاگرت، بەڵام هەتا ئێستا کە من خەریکی نووسینی ئەم تەوەرەیەم، تورکیا وەڵامی لێبوردنی گشتی ڕێبەرانی پ.ک.ک ی نەداوەتەوە و دەیەوێ ناچاریان بکات واز لەو داوایە بێنن و ڕێگای خۆبەدەستەوەدان بگرنە بەر!

شکانی ستراتیژی پ.ک.ک بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم و دەوڵەتی سەربەخۆی کورد، جارێکی تریش بە نەتەوەی ئێمەی سەلماند، کە سۆسیالیزم بە کوردی هەژار دانامەزرێ! بۆ ئازادبوونی خۆشی، تەنانەت ئەگەر کوردی هەموو پارچەکانی کوردستان لە بەرەیەکی نیشتمانیدا کۆببنەوە، بەڵام دیپلۆماسی بەهێزیان نەبێ و نەتوانن بەرژەوەندی ئابووری دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهان لە هەرێمەکەدا بپارێزن و حورمەتی یاسامەندییەکانی ئەمڕۆی جیهان بگرن، دیسان سەرکەوتن بەدەست ناهێنن. بۆ ئەوەی ئێمەی کورد سەرکەوین پێویستە بەپێی هەلومەرجی ڕەخساو لە هەرێمەکاندا بجووڵێینەوە. پ.ک.ک بووە قوربانی ئەو هەڵەکارییانەی و کورد دەبێ لە کردەوەکانی ئەزموون وەرگرێ. هەرچەندە ئێستاش کەسانێک هەن کە نەهاتوونەتەوە سەرخۆ و باوەڕیان بە شکان و ئاشبەتاڵی پ.ک.ک نەهێناوە، بەڵام ڕاستی تاڵە و بەهەموو کەس قووت نادرێت.

PKK ailesine giriş dönemi. Yıllarca uğraş veriyoruz.

Dönüp duruyoruz, ama çok az bir gelişme kaydediyoruz. Önemli olan burada yine devlettir. Devletin Ankara'dan çıkışımıza tavrıdır.

Ben devlete 1966'dan itibaren maddi olarak dayanmışım ve ancak 1977-1980'lerde kopuşa geçeceğiz. Tam 12 yıl, devletin maddi olanaklarıyla, yarattığı ortamla belli bir mesafe almışım. Ve çıkış yapmaya çalışırken çevremize dolanlar var. Yenilmiş veya kemalist sol etkilemeye çalışıyor. Ankara'da Kurtçülük yapmak isteyen KDP temsilcileri var. Onlar da dolaylı olarak kontrol altına almak istiyor-

93



# Kürdistan'da devrim yangını büyüyor

## Uluslararası zor güçleri de bu yangını söndüremeyecek









PARTİYA KARKERÊN KURDİSTAN

PKK

KÜRDİSTAN DEVRİMİNİN YOLU

(MANİFESTO)

